# مەبەست لە زنجیرەی حزبی هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی حزبی هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کوردە بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیەتی لە گشت کوت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گوزارە کاریانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیرو ڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیرو بۆچوونەکانیان بین .

با دەستورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت،

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر





# له دیداری محمد دا

نوسینی:

دکتۆر عـــائض القرنی

وەرگێڕانی:

ئـــارام گەلاڵی

پێداچونەوەی:

نـــەوا موحەممەد سەعید





# له دیداری محمد دا


| | |
|---|---|
| نوسینی | دکتۆر عـائض القرنی |
| وەرگێڕانی | ئـارام گەلاڵی |
| پێداچوونەوەی | نـەوا موحەممەد سەعید |
| بڵاوکردنەوەی | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی ناوەوە | زەردەشـت کاوانی |
| خەت | نـەوزاد کۆیی |
| نەخشەسازی بەرگ | امـین مخـلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ | چوارەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز |
| تیراژ | ١٠٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٣٣١) ساڵی ٢٠٠٦ پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس

Mob: +964 750 460 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

# پێشەکی

*گەلێک دڵخۆشم بە چوار بارە لەچاپدانەوەی ئەم کتێبە ئازیزە، لەبەرئەوەی لەبارەی پێغەمبەرێکی زۆر زۆر ئازیزە. خۆزگە بەهرەیەکی فرە بەرهەراوی زمانەوانیم هەبوایە تا هەرهەموم هەر لە پێناوی وەسفی ئەو زاتە پیرۆزە بەکارهێنابایە. دیارە ئەم چاپە بەبۆنەی ساڵرۆژی لەدایکبونی فەخری کائیناتەوە دەکەویتەوە بەر دیدی خوێنەران. هەر بەم بۆنەوەش ئەم چەندێرەم نوسیوە،*

## موحەممەد نوری رزگاری

بەر لەوەی فەخری کائینات لەدایك بێ..مرۆڤایەتی لە تەواوی دنیادا لەناو چەندین جۆر کارەسات و مەرگەسات و ئێش و ئازاری جەرگبڕدا ناڵە ناڵ و هاوار هاواری بو، ئازارێکی لە یەخە نەدەبوەوە ئازارێکی دی سەرباری بوو. وێڵ و سەرگەردان دەخولایەوە، هەر رۆژەو بەسەرە نێزەیێ برینەکانی دەکولایەوە. چارەنوسی نادیار و ون بو، فێڵ و قۆڵبڕین نەخشهێنان و راستی و سەرڕاستی پیرە دوژمن بو. حەیران و داماو دەسوڕایەوە نەیدەتوانی پاکایەتی و پوکایەتی، بەدایەتی و چاکایەتی جوێکاتەوە، مەشخەڵێ نەبو سۆمای چاوی لە بەدیکردنی هەقیقەت و لە دۆزینەوەی درۆی بەپینە نوێ کاتەوە.
ئەوانی تاکوتوك خوایان دەناسی و رێگەی دینیان گرتبو، رێیەکی بێ تاو و تینیان گرتبو. هەقیان بە هیچ شتێ دانەبو، رۆژێك لە رۆژان هیچ کەسێکیان لە پێناوی دین رانەبو.
مرۆڤایەتیش بە گشتی لە رەوشێکی پڕ پەشێوی، بێ رێوشوێنی پڕ نشێوی، ژینێکی رەمەکیانەی کوڵ و وێڵ، دیدێکی رەمەکیانەی شپرزە و لێڵ، روحێکی

ڕەنگپەڕیوی کرچ و کاڵ، زەمانێکی بێبەزەیی تفت و تاڵ، زوڵمێکی بێسنور و بێنەوا، شەڕێکی بێئامان و بێ پەروا. ژیانی لە تونێلی تاریکیدا بەڕێدەکرد.
مرۆڤایەتی هەڵکڕوزابو، تێکشکابو. چۆن هەڵنەکڕوزێ کە ئیمپراتۆری ئاگرپەرستی گڕی لە نیوەی دنیادا بەردابێ! چۆن تێکنەشکێ کە ئیمپراتۆری بەردپەرستی نیوەکەی دی لە گۆبەندی وێرانکاری تێکبەردا بێ!
مرۆڤایەتیی شەقکراو و قەڵشێندراوی بێدەرەتان، هەر جارەی بە بەزمێ سامالی لێدەکرایە تەمتومان. هەر ڕۆژەی بە ڕەنگێ سێتای شەڕێکیان لەسەری دەبەستا، خوێن جۆگەلە و ڕوباری هەڵدەبەستا، هەمیشە بە ناچاری و بە زۆرداری، بەزەبروزەنگ و جەزرەبەوە دەخرایە بەر بێگاری.
مرۆڤایەتی لە بیریی نەمابو کە بەندەن و بەندەی پەروەردگارێکن، هەرچی هەیە لە تۆزقاڵ و گەردی وردەوە تا کەشکەشان وەدیهاتەی کردگارێکن! مەشخەڵی پەیامی پەیامبەران خامۆش و هەر ئەوەتە پرتەوێکی لێدەهات و نەدەهات، بیری خواپەرستی ڕاستینە لە ئەندێشان فەرامۆش و هەر ئەوەتە بە بیران دادەهات و دانەدەهات. لە ژینێکی ئاژەڵیانەی بە گەللایی و هیچ نەناسی، لە نەفامیی خوانەناسی بە کەساسی تێوەگلابون.
ئەوی چاوی بە دنیا هەڵدەهانی، لە دڕندەیی و کەڵبەتیژی یا خوگرتن بە توندوتیژی چیدیکەی نەدەدیت و چیدیکەشی نەدەزانی. لە دیوەخان و جەمخانەی ئیبلیسانی دەبوە سەماکەرێکی ژەقنەموتی، لە پێناوی چێژێکی خۆپەرستانی هەرچی دەستیکەوتبایە هەڵیدەلوشی و دیکردە قوتی.
مرۆڤایەتی لەناو تاریك و تونی تاریکستانی تاریك تاریك وەك کوێر و بە کوێرەوەری پەلیدەکوتا و گێژی دەخوارد و دەکەوت و هەڵنەدەستایەوە، تاریکی لە ناو تاریکی، تاریکی لە بن تاریکی، تاریکی لەسەر تاریکی، تاریکی بۆ تاریکی، تاریکی لەتەك تاریکی، تاریکی تاریکی ڕادەدا و هەر تاریکی هەڵدەهات و نەدەبڕایەوە.
ئاوهابو ڕەوشی دنیا، چاوەڕێ بون ڕوناکاییەك، تامەزرۆبون تروسکاییەك، بە هومێد بون دەرەتانێ، بەهێز و تینوتاوێکی واپەیدابێ کە بتوانێ لەو زۆنگاوەی کە مرۆڤایەتی تێیدا خنکاوە، تەکانێکیان پێبدات و بەرەو ژیانێکی بەختەوەر و

کەنارێکی پڕ لە ئارامی دەستیان بگرێ و رزگاریان کا.
هەر هێندەیان زانی فریادڕەسێ، کە روناکی بو بۆ گشت کەسێ، بانگی رزگاری راهێلا، زەوینی مرۆی سەرلەنوێ کێلا، ئەو دارەبەرزەی لە رەگ چاندەوە، کە سێبەرەکەی دنیای گرتەوە، ئەوانەی شەیدای خۆشی و خۆشبەختین، دەیانەوێ لەو ئیش و ئازارەی کە پەکیخستون یا زۆرداران وەك فەرشی بەرپێیان کە رایانخستون، با بێن لە بەری ئەو دارە بەرزە نۆشی گیانی کەن تا هەم لە دنیا و هەم لە دوای دنیا بە هەمیشەیی بەئازادی و بێئازار بژین.
پێغەمبەر کە بەو نورە بێسنورەی خوا پێیدابو، بۆ رزگاری گشت مەردومانی زوڵمستانێ رابو، ئەو نورە پڕتەو و درەوشاوە، ئەو زاتە پاکەی کە لە پاکیدا پوختە رسکاوە، کە لە مەردومانی روانی، دیتی لە ناسینی خوای تاقانە رێیان لەبەر بزربوە و لەناو رەشەبای نەفامیدا وەکو پوشن، سوژدە بۆ دار و بەرد و رۆژ و ئەستیران دەبەن و لەمەڕ زۆردارانیش ورە روخاوی سەر بە کڕنوشن.
دەیدی بەدکاری شاباشی بۆ دەباری، هزری پوکەڵە پیاوی پێ کەڵە، ئەوی بەهێز بوو بێهێزانی دەهاڕی، نێر نەبو بڵێ لەل کە بەسەریاندا دەقاڕی. ئارەق و شەراب گێژی کردبون، ژینی لێکردبون بە سەراب، بێهودەیی باڵی بەسەریاندا راکشاوە، بۆیە مرۆ لە بێزاری و بێهیوایی لێی راکشاوە. زیناکاری و دەستدرێژی بۆ سەر ناموسان، رێگری و دزی و جەردەیی و روتکردنی کاروانان و راوەدونانی بێکەسان، پەرەی ستاندوەو دەستی لەخەڵکی ستاندوە. ریباخۆریی و پارەستاندنی بە سۆرەسۆری بەربینگی لە خەڵکی بڕیوە و رێی بازرگانی و پارەداری و خۆشگوزەرانی لە زۆرینەی خەڵکان داپچڕیوە.
دەیدی پاشا و قەشەکان، کاربەدەستە دڵڕەشەکان، بەرپرسانی خۆبەزلزان، سەرەك هۆزی هیچ پێنەزان، دەستیان لە خنخنۆکەی خەڵکی راژەنیوە، زوڵم و زۆریان گشت شوێنێکی تەنیوە. خۆیان لە خەڵکی کردۆتە خوا، بە بەرژەوەندی خۆیان بڕیاردەدەن کە چ حەرامە یا حەلاڵ، چ شت شیرینە یاوەخۆ تاڵ، کامە رەنگ تۆخە و کامەیان کاڵ، کام رێگا هەقە و کامیش نارەوا.
ئەو نورە هات و رەگوریشاڵی نەفامی لەناو دلان دەرکێشا، دلانی وەك عیشق و شەیدای پەروانە بەرەو ئەو نورە راکێشا، بیروباوەرێکی ئازاد و رێبازێکی پڕ لە

دادی پێبەخشین، وەك گوڵ گەشانەوە و بە سەدان رەنگی جوان جوان نەخشین و رازانەوە. ژیانێکی پێ نیشاندان تەواو تەواو جیاوازبوو لەگەڵ ژیانی پێشان. ئەم ژیانە شەوق و روناکی، سادەیی و پاکی، پیاوەتی و چاکی، مەردی و بێباکی، وزەی زانایی، هێزی دانایی، روحی رزگاری، پێزی ئێجگاری، بەهای بەرز و جوان، رێچارە و هەتوان، نەرمونیانی، ناسینی جوانی، هەستی خواناسی، دیدی هەقناسی، ئارامی و هەدا، بەزەیی خودا، دەستی یارمەتی، نییەتی پەتی، دڵسۆزی و نەوا، چەسپانی رەوا، روحی خێرخوازی، دنیانەخوازی. هەرچی خۆشیە و دڵ پێی خۆشنودە، لەو ژیانەدایە.
ئەم ژیانە تەواو جۆرێیە. وجود مانای تازەی هەیە. مردن نەناسراوێ نیە، ژیان ئاسانراوێ نیە، غەیب و پەنهان ئاشنایە، وجود خەڵقی خوای دانایە، هەوڵ و تێکۆشان لە ئارایە، ئامانجی جوان لە دلان دایە. کەس بەبێزاری و بێهودەیی وەختی خۆی نافەوتێنێ، بەڵکو لەپێناو رێی خێر و چاکە بەکاری دێنێ. ئەو ژیانە بەهەشتێکە لەسەر دنیا، یەك ترس هەیە ئەویش ترسان لە خوای تاك و تەنیا.
لەم ژیانەدا ئیسلام بەرنامە و رێبازی تاقانە بو، ئەوی بە موسڵمانی دەژیا دڵی پڕ لە خۆشیی شاهانە بو. پەیتا پەیتا ئیسلام پتر بلاو دەبویەوە، دەسەلاتی بێباوەڕی کورتی دێنا و بەرەو نەمان دەچویەوە. ئیسلام بویە دەوڵەتێکی خاوەن پەیامی رزگاریخوازی، پایەبەرز و تۆکمە و بەهێز، جێی شانازی، زوڵمەت و زوڵمستانی بەرد پەرستی و گڕ پەرستی تارومار کرد، ژێردەستان و بەندە و کۆیلە و مەزڵومانی رزگار کرد. خەڵك وەك گوڵ گەشانەوە، بە روحێکی زیندوی تازە سەر لە نوێ ژیانەوە.
لەم ژیانەدا کەس نیە لە کەس گرنگتر بێ مەگەر لە تەقوا رەگاژۆتر بێ، خوێنی کەس لە هیچ کەس رەنگینتر نیە، بونی کەس لە هیچ کەس بە پەرژینتر نیە، هەمو یەکسان و وەکو یەکن، خاوەن یەك ماف و هەقن، کۆمەڵگە بەپێی داد و یەکسانی، قایم چەسپیوە ژیانی.
لەم ژیانەدا نیشتمان نیشتمانی ئیسلامە، بیروباوەڕ بۆتە پێناس و رەگەزنامە، سنور و کەوشەن دانەندراوە، خەڵك گشتی یەك چینە بە چین چینی نێوانیان نەپچڕاوە. مرۆڤ هەر مرۆڤە و بەندەی خوایە، خاك هەر خاکە و ئەرزی خوایە.

نوری ئەو پەیامبەرە خۆشەویستە دنیای ئینسانی روناك كردەوە، ژیانی لە ژەنگی بەردپەرستی و گرپەرستی و مرۆپەرستی و خۆپەرستی پاك كردەوە.
هەزاران هەزار درود و سەلام ئەی پێغەمبەرەكەی هەرە نازیز. لەگەڵ تۆدا وەرزی دڵ هەر بەهارە و قەت قەت بەسەری دانایێ پایز.

# فیداتم یارسول الله

شەو من شەیدام وەک پەروانە
رۆژ بێنەوام وەک دێوانە
هێندە تەنیام لە خەڵوەدام
دڵ بێ لانەم و هەڵوەدام

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

مەحەبیـــەتت دڵمی پڕ کرد
بەیەک چـۆڕی بونمی سڕکرد
ئیشق بە رەنگینی نەخشی
خۆشی روحی بەمن بەخشی

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

کۆڵ بەشانم وەک کۆچەرێ
چەندین ساڵە کەوتومەرێ
بە حەزرەتم بەس بۆجارێ
تاسەم بشکێ بە دیدارێ

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

لەدوری تۆ هەر خۆم و خۆم
بەدەوری خۆم وا خول دەخۆم
هەر پایزەو بێ بەهارم
هەڵدەوەرێم تارومارم

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

هەزار پاشایی سەرتەختێ
ناکا هاودەمیت بۆ نەختێ
دیدەنی تۆ ساتە وەختێ
بێباکییە لە گشت سەختێ

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

خەمی دوریت چەندە سەختە
ئەوی تۆی دی چەند بەبەختە
خۆشەویستیت خەم تارێنە
خۆشی و چێژە سۆز بارێنە

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

نوری پاکت وەکو باران
دادەبارێ بەسەر یـاران
ئەوی یار بێ بەختەوەرە
لە کەرمەسێر بەرسێبەرە

فیدای خۆڵەکەی بەرپێتم یارسول الله
ئاشقی روناکی رێتم یارسول الله

# پێشەکی وەرگێڕ

وەرگێڕ، لە وەرگێڕانی هەر کتێبێ تاموچێژێك وەردەگرێ، وشە بە وشە و ڕستە بە ڕستە لەگەڵیدا تێکەڵ دەبێ. هەر وشەیەك بریسکەیەکی تایبەت و هەر ڕستەیەك تیشکێکی سەربەخۆ و هەر کۆپلەیەك شەبەنگێکی جیاواز پەخش دەکەن، وەرگێڕ دەخەنە دنیایەکی پڕ لە هەست و بە روحیەتی تێکست و ماناکانی ئاشنا دەکەن.
لە ناخی هەر تێکستێکدا ژیانێك هەیەو خوێنەر لە ساتی خوێندنەوەکانیدا، دەبێتە ئەو گەشتیارەی کە بە خەیاڵ تێیدا دەسوڕێتەوەو دەچێتە بەر کایە و سیحری نوسینەکانەوە. بەڵام وەرگێڕ وێڕای گەشتەکەی، قەڵەم و هەست و تێڕوانینەکانیشی دەکاتە کامێرایەك و تا پێیدەکرێ بە جوانترین و هونەریترین شێواز، وێنەی گەشتەکەی دەگرێ و دوای مۆنتاژکردن، بۆ هاوزمانانی ڕادەنوێنێ.
من لەم گەشتەدا تا ئەوپەڕی چێژم وەرگرتوەو هەوڵمداوە بە کامێراکەم، بە جوانترین شێوە لە دیدارەکانی ئەو ژیانە ڕامێنم و دیمەنەکانی بگرم. ڕەنگە وێنەگرێکی باش نەبم، بەڵام دڵنیام کە چێژێکی ئێجگار روحی لە دیمەنەکانی ژیانی ناو ئەم کتێبەدا هەیە، چونکە دیمەنی ژیانی زاتێکی ئەوەندە بەرزو بالایە، کە لە دونیا تاقانەیەو لەو بەهەشتەی بۆ ئادەمیزادان سازاندویەتی بێهاوتایە، نوسەریش لە ڕەوانبێژی و پەخشاننوسیدا بالادەستێکی دانستەیە و خێوی زانستێکی بەرهەراوە، توانیویەتی وەك ئەدیبێکی قەڵەم بەبڕشت و کەسێکی کاراو کارامە، زۆر بە کورتی و بەتەواوی تیشك بخاتە سەر دیمەنەکان.
ئەو دیمەنە جوانانەی لەم کتێبەدا رانوێنراون، دیمەنی بێهاوتان و لە مێژوی مرۆڤایەتیدا یەك جار هاتونەتە ئارا، یەك جار دیدەنی خەڵکی پێ ئاشنا بوە، یەکجار ئاسمان و زەوی شاگەشکە کردوە، یەکجار بیابانەکان گەرمەسێری خۆیان

ونکردوە، یەك جار دێهاتەکان بەرەکەتیان بەسەردا باریوە، یەك جار مرۆڤەکان دووجار لە دایك بونەتەوە، یەکجار روحیەت و سۆز و بەزەیی و ئازایەتی و ئارامی و بەخشندەیی لە جوانترین دیمەندا وەدەرکەوتون.

تۆش! کچە کورد و کوڕە کوردی دینپەروەر و ئاشقانی رەوشتە بەرزەکی پێغەمبەر، وەرە یەك جار گەشتێ بەو دیمەنە دڵرفێنانەدا بکە، تا سەدان جار چێژ و ئاسودەیی وەرگری. وەرە یەك جار لە دیداری ئەم ژیانە پاك و پیرۆزەدا ئامادە بە، تا هەزار جار بەختەوەر بی، روحت وەك پەرەسێلکەیەك بە ئاسمانی شادیدا هەڵفڕێ و شادی بە ژیانت وەربێتەوە.

ئارامی گەلاڵی
٢١-٤-٢٠٠٦

# بەختەوەریی یاران

چەند بەختەوەرن ئەوانەی گەورەترین جیهانی خۆشەویستی ڕاستەقینەیان بەدیکردو لەگەڵ خۆشەویسترین خۆشەویستیان سەردەمێکیان بەسەر برد!
چەند بێخەمن ئەوانەی لەسەر فرەوانترین باڵی بەرزەفڕدا، گەشتێکی راستەقینەیان بەناو جیهانی میهرەبانیدا کردو لەگەڵ جوانترین دیمەنی دڵڕفێندا رۆژگارێکیان بەڕێ کرد!
چەند روح ڕەنگاوڕەنگن ئەوانەی لەسەر جوانترین پەلکە زێڕینەی ڕاستەقینەدا، لەگەڵ ڕەنگە جوانەکانی وجوددا تەمەنیان پێشکەش بەروح کرد!
چەند ئاسودەن ئەوانەی وەك جوانترین ماسی لەناو فرەوانترین دەریای بێسنوردا، مەلەیان کردو کریستاڵیترین گەوهەریان تێدا دۆزیەوەو کردیانە مەدالیایەکی سەرمەدی و لە سینەیان هەڵواسی!
چەند خۆشبەختن ئەوانەی روحانیترین گەشتیان، لەگەڵ پیرۆزترین روحدا کردو توانییان سپیترین روح بکەن بەئارامگاو تا ئەبەد لەگەڵیدا سەربردە بێگەردەکان بۆ یەکتری بگێڕنەوە!
چەند دڵخۆشن ئەوانەی لەسەر پشتی روناکی بون بەمیوانی کۆترە بن باڵ سورەکان و نەرمترین و گەرمترین هێلانەیان بۆ باڵندە تەریوەکان پێکەوە ناو پاشان دڵۆپ دڵۆپ توانەوەو بون بەتاڤگەیەك لەخوێن!
چەند ڕوخۆشن ئەوانەی بونە رێبواری رێی پەپولان و ناسکترین ژوانیان بۆ ئاشقانی چێژی ئەبەدی رەخساندو پاشان لەمەشخەڵی سوتاندنی گوناح و حەسرەتدا بونە روناکی بەردلان و سۆمایان دایە چاوان!
چەند بەهرەوەرن ئەوانەی لەسافترین کانیاوی مەعریفەوە تێنوێتیان شکاندو لەگەڵ نایابترین تروسکەدا پێکەنین و سرودیان بەبالای هزردا چڕی و بۆ جارێکی تر خەونی بەدێوەزمەیان نەبینیەوە!

چەند ئاسودەن ئەوانەی هەمیشە خەونی شیرنیان دەدی و بەبالای لاولاوە بالاکاندا هەڵدەچون و لەبەرزی هەرە بەرزەوەڕا، لەگەڵ گەردی بەیانی، لەبەهارێکی هەمیشەییدا بەخەبەر دەهاتن و دنیایەك لەفەرەحنایی بێسنوریان لەدڵدا هەڵدەبو!
چەند شادن ئەوانەی لە بیابانی کاکی بەکاکی تەنیاییداو لە هەڵقرچاوترین گەرمەسێری روح سوتێندا، لەگەڵ ئازیزترین یاری بێوێنەدا، سەدان کانیاویان هەڵقولاندو بەهاریترین دیمەنیان لەسەر خوانێکی بەهەشتی سازکردو زەماوەندی فەرەحنایی تا ئەبەدیان بەهەزار ئاوازە دەنگی دایەوە.
ئای کە چەند خۆشە لەگەڵیاندا ببین بەو خوناوانەی کە هەمو رۆژێ لەبەر گزنگی پڕ لە شادمانیدا، تەمەنێکی ئەبەدی بەروحیان دەبەخشنەوەو تا هەتایە لەگەڵ کریستاڵە ڕوناکەکاندا ببریسکێینەوەو شەبەنگی شادی پەخش کەین.

* * *

# پێشەکی نوسەر

سوپاسی بێسنور بۆ خوای بالادەست و کار پڕ لەخێرو میهرەبانی، درودو سڵاویش لەسەر محمد (صلی الله علیه و سلم) ی پەیامبەرو هەم خانەوادەو یارانی.

من کە لەبارەی خۆشەویسترین کەسی ناو دڵم کە محمدی پێغەمەبەرە (صلی الله علیه و سلم) شت بنوسم، هەرگیز ناتوانم بێلایەن بم. چونکە من لەبارەی سەرکردەیەکی سیاسیەوە نانوسم کە چەند توێژینەوەیەکی پێشکەش بە گەلەکەی کردبێ، یا ڕاوبۆچونەکانی بۆ شوێنکەوتوانی ڕانواندبێ[1] تا لەسوچێك لەسوچەکانی سەرزەمین دەوڵەتێك دامەزرێنێ. بەڵکو من لەبارەی ئازیزترین پەیامبەری پەروەردگاری گشت جیهانەوە دەنوسم کە نێردراوێکی میهرەبانە بۆ تەواوی خەڵکانی دنیا.

هەرگیز ناتوانم بێلایەن بم، چونکە من لەبارەی سوڵتانێکی بە دەستوپێوەندو خاوەن سەربازو سوپاو ئەسپ و چارەوێ و زەوی و زارو گەنجینەی پڕ لەزێڕو گەوهەرەوە شت نانوسم، بەڵکو من لەبارەی ئەو خەلاتە میهرەبان و بەهرە ڕێنیشاندەرەوە دەنوسم کە موحەممەدە (صلی الله علیه و سلم).

هەرگیز ناتوانم بێلایەن بم، چونکە من لەبارەی سوڵتانێکی بە زەبروزەنگی بە تەنتەنەی گەل چەوسێن و تۆقێنەرو خۆڕانوێن و لوتبەرزەوە نادوێم، بەڵکو لەبارەی ئەو زاتە پاکەوە دەدوێم کە خوا سینەی گوشاد کردوەو لە گوناحان پەرژینی کردوەو ناو و دەنگی بەرز کردۆتەوە.

هەرگیز ناتوانم بێلایەن بم، چونکە من لەبارەی شاعیرێکی بەدەنگوگۆ یا وتاربێژێکی بڵندگۆ یا فەیلەسوفێکی سەرگەردان یاوتەبێژێکی قسەزان یا

---

(١) ڕانواندن: خستنەڕو

ڕۆماننوسێكی خەیاڵێنەر یا نوسەرێكی وەڕازێنەر یا لەبارەی بازرگانێكی خۆشگوزەرانەوە نادوێم، بەڵكو لەبارەی دواهەمین ئەو پەیامبەرەوە دەدوێم كە سروشی بۆ نێردراوەو جبریلی بۆ بەرێكراوەو گەیشتۆتە سیدرەی مونتەها[1]، كە خاوەنی تكای مەزن و پایەی مەزن و كانی كەوسەرو پایەی ستایشكراو ( المقام المحمود ) و ئاڵای شەكاوەی ڕۆژی دواییە. كەواتە چۆن دەتوانم بێلایەن بم!
ئایا گەرەكتە سۆزەكانم لەزیندان بپەستم و مەیلەكانم لەكۆتوبەند بخەم و خورپەكانی دڵم ڕاگرم كە من لەبارەی خۆشەویسترین ئینسانی ناو دڵم و بە بەهاترین پیاو و ئازیزترین خەلقی خواوە بنوسم؟ بەڕاستی داوایەكی عەنتیكەیە!
گەرەكتە فرمێسكەكانم قەتیس بكەم كە ڕێژینەكەی بنوسمەوە! كڵپەی ڕوحم كپكەمەوە كە سەربردەكەی بخەمەڕو! جۆشی دڵم دامركێنمەوە كە یادگاریەكانی بگێڕمەوە!
نا ناتوانم، نا، هەزارجار نا. چونكە من لەبارەی پێشەنگ و پێشڕەوێكەوە دەدوێم، كە سەرتاپای ژیانەكەی بە نوری هیدایەت ڕوناكبۆتەوە.
كە نوێژ دەكەم یادی دەكەمەوە، چونكە خۆی فەرمویەتی:
صلّوا كما رأيتموني أصلي: چۆنتان دیوە كە نوێژم كردوە ئێوەش ئاوا نوێژ بكەن[2].
كە حەج دەكەم یادی دەكەمەوە، چونكە خۆی فەرمویەتی:
لتأخذوا عنّي مناسِككُم[3]: ڕێوڕەسمەكانی حەج لەمنەوە وەرگرن.
لە هەر چاو لێكدانێ یادی دەكەمەوە، چونكە خۆی فەرمویەتی:
من رغبَ عن سنّتي فليس منّي[4]: ئەوەی لە ڕێوشوێنی من لادا، لەمن نیە.
لە گشت چركەیەك یادی دەكەمەوە، چونكە خوا فەرمویەتی:
﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾[5]:

---

(١) سدره المنتهى: دواهەمین قۆناغی میعراج .
(٢) البخاری ٦٣١.
(٣) مسلم ١٢٩٧.
(٤) البخاری ٥٠٦٣ ومسلم ١٤٠١.
(٥) (الأحزاب - ٢١).

بێگومان لە پێغەمبەری خواوە پێشەنگێکی چاکتان بۆ هەیە.
من لەبارەی بەهادارترین و بەرێزترین و پاکترین و باشترین مرۆڤەوە دەدوێم. ژێدەرەکەشم[1] ئەو خۆشەویستنامەیە کە وا لە ناو دوو توێی دڵمدا هەڵگیراوە، سەرچاوەکەشم ئەو دیوانەیە کە پڕە لە سەرسامی و لە ڕوپەڕەکانی یادگەمدا نوسراوەتەوە. کە وەسفەکانی دەنوسم، دەڵێی لەدەمارەکانی جەستەو مولولەکانی دڵمەوە هەڵدەرژێن، دەڵێی خوێن و فرمێسکەکانم بونەتە مەرەکەب.

(١) ژێدەر: سەرچاوە، مرجع .

# تاسەی دیداری

ئەی پێغەمبەری فەخری کائینات
رونایی چاوان چەند بەرزە بەهات
کە هاتی نەما بەندی و بێگاری
لەئاسۆ هەلات خۆری رزگاری
بەتۆ ئارامە روحی داماوم
روناکە شەوی ژینی تاراوم
کە دێمە خزمەت جوانی و پاکی تۆ
بینایيم ڕونە بەروناکی تۆ
هەرچەند لە شەوقی سیمات ڕامێنم
بڕوا بەراستی وگەورەییت دێنم
ئازیزی دلان ا بەروح فیداتم
تا دواهەناسە لەسەر رێگاتم
ئاشقی سام و میهرەبانی تۆم
زامی ئیشقی تۆ سارێژ نابێ بۆم
قوربانی تۆ بم سەدهەزار جاری
نەتبینم ناشکێ تاسەی دیداری

# ناوی محمد (صلی الله علیه و سلم)

محمد، ناوێکە سازە لەگەڵ کەسێتی ئەو پێغەمبەرە (صلی الله علیه و سلم)، هێمایە بۆ بڵندی، وەسفە بۆ پێشڕەوی. تەواوی واتاکانی ستایشی لەخۆدا هەڵگرتوە، گشت پایەو ڕێزێکی گرتۆتەوە، باڵی بەسەر گشت بەهاکاندا کێشاوە. لەناو ناوان تاقانەیە، لە سەرمەشقیی بێوێنەیە. خوا بەپەسنی هەڵیداوەو پڕ بەچاکی لێیدواوە، چونکە دوایین نێردراوە، بەندەی ئازیزی خوایەو لەناو خەڵکان بژێردراوە.

لەلای خەڵکیش ستایشکراوە چونکە نزیکی دلان و خۆشەویستی دەرونان و خەلاتی میهرەبان و بەهرەی ڕێنیشاندەرو پێ و قەدەم بەخێرو بێرە. لەهەر شوێنێ بوایە خوا چاودێری بو، لەهەر کوێ مابایەوە یا بۆ هەر کوێ دەرچوبایە خەڵك ڕێزی لێدەنا. ئاکارەکانی جێی سوپاس و ستایش بون چونکە سروش مشتومالی کردبون. ڕەفتارەکانی پڕشکۆ بون، چونکە بە نوری پێغەمبەرێتی بێگەرد ببون. موحەممەد لەلای ئەو خوایەی کە خاوەنی ستایشی هەمیشەیی و بێسنورە، ستایشکراوە.

هەروەها ناوی ئەحمەدیشە، عیسا بەم ناوە موژدەی هاتنی ئەو پێغەمبەرەی بەگەلەکەی داوە. هەروەها (عاقیب: پاشەنگ و حاشیر: کۆکەرەوەو ماحی: کوفر سڕێنەوە)ش ناوی ئەم پەیامبەرە پیرۆزەن کە دوایەمینی پەیامبەرانە، لەرۆژی مەحشەر کە دێنە لای وتاربێژیانە، بۆ چونە سەر کانی کەوسەریش پێشەوایانە.

خاوەنی کانی کەوسەرو ئاڵای شەکاوەو پایەی ستایشکراو و ئومەتی دەست و باسك و نێوچەوانی سپی و نورانییە. لە تەورات و لەئینجیلدا باسی کراوەو بە جبریل پاڵپشتی کراوە. هەڵگری ئاڵای شکۆ بو لەبەنی لوئەی، پلەو پایەبەرز بو لەبەنی عەبدومەنافی بەنی قوصەی. خاوەن ڕێزێکی مەزنە، بەشکۆترین کەسە

لەناو دلان، هەڵبژێردراوە لە سەرتاپای شارو بیابانان، پڕبەهاترین چاکەخوازە، هەم رێبەرو رێنوێنسازە. روگەش و سینگ فرەوانە، ناوبانگی بەربلاوە وا لەتەشقی ئاسمانە، کاری لەجێ و بێگرێیە، پەیامبەری شارو دێیە. خاوەن ئاکاری سوپاسگوزار، بەسەرکەوتن پارێزراو، لەگوناهان پەرژین کراو، لەولاتان دیارو ناسراو. بۆ سەردەمان بەرەکەتە، بۆ بونەوەران نیعمەتە.

ئەی محمد (صلی الله علیه و سلم) بەقەد زریوە زریوەی ئەستێران و جریوە جریوەی باڵندان، بەقەد رێژەنی دەریاکان و رێژەی دڵۆپی بارانان، لەگەڵ هەرهەڵکردنێکی سروەی بەیانان و بەقەد ژمارەی گەشتی فریشتان، درودو سڵاوی خودا لە تۆ و لە خانەوادەو یارانت بێ .

# ڕەچەڵەکی محمد (صلى الله عليه و سلم)

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) چاکێك بو لە چاکان بو. ڕەچەڵەکی پشت بەپشت هەر بە پاکی و بەڕەسەنی هاتۆتە خوارێ. باوانی، گەورەی خەڵکی بون. باپیرانی سەرەك هۆزو عەشیرەت بون. لە هەوەڵیان هەتا ئاخیر جوامێرو دلێرو مەرد بون. خاوەن هەڵوێستی جوان و پیاوی مەندو نەبەرد بون. کەس نەبو لە عەبدولموتەللیب بەشانوشکۆتر بێ، کەس نەبو لە هاشم نەجیمزادەتر بێ، کەس نەبو لە عەبدومەناف پایەدارتر بێ، کەس نەبو لە کەعب بەڕێزتر بێ، بەمجۆرە تا بەئادەم دەگاتەوە. پێغەمبەریش مەزنی کوڕی مەزنان بو، ڕێزو ڕەوشتی پشت بەپشتی بابوباپیرانی هەبو.

# زێـدی محمد (صلى الله عليه و سلم)

خوا لەنێو هەمو خاك و ناوچەكانی سەر زەوی خۆشەویسترین زێدی[١] شایەن كرد بەوی. زێدێكی بە حورمەت و پارێزراو و چاودێریكراو، خۆڵێكی پاك، خاكێكی پیرۆز . محمد (صلى الله عليه و سلم) لەم زێدە -كە مەككەیە- لەدایك بو، ئەو مەككەیەی كە پێغەمبەران نوێژیان تێدا كردوە، نێردراوان[٢] شەونخونییان تێدا كێشاوەو لە خوا پاڕاونەتەوە، كە سروشی لا دابەزیوەو روناكایی لا هەڵهاتوەو پەیام شەوقی تیا داوەتەوە، پێغەمبەرایەتی لا درەوشاوەتەوەو گزنگی پێغەمبەرایەتی تێدا دەركەوتوە. ئەو مەككەیەی كە كەعبەی دێرین و پەیمانی پتەو و خۆشەویستیەكی بێئەندازەی لە ئامێزدایە، ئا ئەو مەككەیە زێدی پەیامبەری پاكە، كە لانەی ساوایەتی و جێگەی گەمەی منداڵێتی و پیاسەی جحێلایەتی و سەیرانگەی لاوێتی و واری[٣] دڵخۆشیی ئەو بو.

لەوێ شیری پاكی پێدراوە، لەوێ هەناسەی مەردایەتی وەرگرتوەو لەكانیاوی جوامێری ئەوێی خواردۆتەوە، لەوێ هەڵساوەو دانیشتوەو هات و چوەو خەوتوەو ڕابوە، ئەوێ یەكەم زێدو نیشتیمانی بو، دایەو بابەم قوربانی بن، ئەوێ زێدی خۆشەویستی ناو دڵی بو، ئەوێ ئارامی ڕوحی بو.

لەوێ - لە مەككەدا - داستانە هەرە گەورەكەی دەسپێكرد، بانگەوازە مەزنەكەی بەڕێكرد، وتارە راست و پڕتەوەكانی بەدنیادا بلاوكردەوەو پەیامە روناك و

---

(١) زێد: جێگەی لەدایكبوون، نیشتمان .

(٢) نێردراوان: مرسلون .

(٣) وار: هەوار.

شکۆدارەکەی بۆ گەلان نارد. تەنانەت کە لەم زێدە شیرنە پەرگەندەیان کرد، ئەوەندە سۆزو غوربەتی هەڵسا خەریکبو بەرگە نەگرێ:

﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ۝١ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ۝٢﴾

سوێند دەخۆم بەم زێدە - کە مەککەیە-. تۆش لەم زێدە کە نیشتەجێی[1].

(١) سورة البلد.

# منداڵێتی و گەنجێتی



## (صلى الله عليه و سلم)

کە هاتە دنیا پاکی و مزگێنی لەگەڵیدا هاتن، سەرکەوتنیش بوە یاری. لە مندالانی دیکە جیاواز بو، منداڵێکی سەنگین و پاکژ و بلیمەت و زیرەك و لێهاتو و زیت[1] و زرنگ و هۆشمەند بو. چاوی چاودێری ئاگاداری بو، دەستی پاراستن هاریکاری بو، گەلاکانی سەرپەرشتی سێبەریان لێدەکرد. لەناو مندالان لێشاویك بو لە ڕوناکی، خوا لە هەڵەپاسی و ڕەفتاری بەدو ئاکاری بێزەوەرو هەڵسوکەوتی ناشرین دەیپاراست، چونکە ئەو لەژێر چاودێرایەتی پەروەردگاردا بۆ چاکسازاندنەوەی جیهان و بەختەوەری مرۆڤایەتی ساز کراوە، تا خەڵك لە تاریکاییەکانەوە بەرەو ڕوناکی رزگار بکا.

ئەو پیاو بو بەڵام پێغەمبەر بو، مرۆڤ بو بەڵام خاوەن پەیام بو، بەندە بو بەڵام گوناحنەکردە بو، ئادەمیزاد بو بەڵام سروشی بۆ دابەزی بو.

محمد (صلى الله عليه و سلم) هەر بە تەنها ڕابەر نەبو، چونکە رابەرەکان بەقەد ژمارەی موی سەر زۆرن و تەماحگیری جۆرەها نێوبانگ و پلەوپایەو دەسکەوتەکانی دنیاشن، بەڵام ئەو هەم چاك و هەم چاکسازیش بو، ڕێنوێن و ڕێنوێنکاریش بو، قورئان و سوننەت و روناکی و هیدایەت و زانستی سودبەخش و کردەوەی چاکی هەبو، ئەو ڕێنوێنی دنیاو دوایی بو، ئاسودەبەخشی روح و جەستە بو.

---

(١) زیت: ئازاو توندو تۆڵ و وریا .

محمد (صلى الله عليه و سلم) هەر بەتەنها زانا نەبو، بەڵکو -بە ئیزنی خوا- زانایانیشی فێر دەکرد، فەقیهانیشی شارەزا دەکرد، بەرچاوی وتارێژانیشی ڕۆشن دەکردەوە، دانایانیشی ڕینوێن دەکرد، خەڵکانیشی بە ڕێگای ڕاست ئاشنا دەکرد.

﴿ ...وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ ﴾

تۆ خەڵك بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنوێن دەکەی[1].

محمد (صلى الله عليه و سلم) پاشایەك نەبو دەسەلاتی فرەوان بکاو دەستوپێوەندو سەربازانی بلاوکاتەوە، بەڵکو پێشەوایەکی پاك و پێغەمبەرێکی نێردراو بو، موژدەدەرو ترسێنەری هەمو پاشاو میللەتان و ئازادو کۆیلان و سپی و ڕەش و عارەب و غەیرە عارەبان بو:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةٗ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾

ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە بەزەیی بیت بۆ هەمو خەڵکی دنیا[2].

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) فەرمویەتی:

والّذي نفسي بيده لا يسمع بِي أحد من هذه الأمّة يهوديّ ولا نصرانيّ ثمّ يموت ولم يؤمن بالّذي أرسلت به إلاّ كان من أصحاب النار[3]

سوێند بەخوا هەر کەسێکی ئەم ئوممەتە، جولەکە بێ یاخود فەلە، ئەگەر لەبارەی من ببیستێ و باوەڕم پێنەهێنێ و بمرێ ئەوا دەبێتە یەکێك لە دۆزەخیەکان.

لە گەنجێتیدا لەناو هەمو گەنجان دیارو لە هەمویان کەشخەتر بو، خاوەن بیرو هۆشێکی فرەوان و دەسپاك و داوێنپاك و دەمپاك و ڕەوشتپاك و دەرو دەرون روناك

---

(١) (الشورى- ٥٢)

(٢) (الأنبياء- ١٠٧).

(٣) أخرجه مسلم ١٥٣ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

و بێگەردو جوامێرو بەویقارو بەحورمەت و بەبرادەرایەتی و ئاکار شیرن و قسە ڕەوان و درۆ نەکردەو خاوەن هەڵوێستی پیاوانەو ڕاستگۆ بو، ڕێزێکی زۆری لە میوانان دەنا، نەزانراوەو نەبیسراوە هیچ لەکەیەکی هەبوبێ و قەت نەنگی و کەموکورتی لا نەوەشابێتەوە.

دوژمنانی، لەگەڵ ئەوەی دژایەتیەکی توندوتیژیان دەکردو رقێکی ئەستوریان لا هەڵگرتبو و کینەیەکی بەکسپوکۆیان بەسەردا هەڵدەڕشت، ئەوجا نەیانتوانی هەڵخزینێکیشی لا وەدیکەن، تەنانەت لە تەواوی ڕەوشت و هەڵسوکەوتەکانیدا نەیانتوانی تاقە لەکەیەکیشی لەسەر تۆمار بکەن، بگرە بەپێچەوانەوە هەرچی دەیاندی هەر مایەی توڕەبونی ئەوان بو، چونکە هەڵوێستەکانی بریتی بون لە جوامێری و پەرێز پاکی، لە ڕێژینی پڕ لە چاکی، لە ڕاستگۆییەتی لە ڕۆژی روناکیش ڕونتر، لەپاکژیەکی لەئاوی بارانێش پاکتر. گشت ڕەوشت و هەڵسوکەوتەکانی هەر ئاوا جوان و پڕ لە جوانی بون. لە هەڕەتی گەنجێتیدا گەنجینە بو بۆ سپاردان، لە ڕاوێژان دەمڕاست و براگەورە بو، لە حوکمدان سەرچاوە بو. لە چاکی و سەربڵندی و سەرڕاستی ڕەوانبێژیدا سەرمەشق بو.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

بەڕاستی تۆ لەسەر خورەوشتێکی بەرزی[1].

---

(١) (القلم-٤).

# پێغەمبەرێتی محمد (صلی الله علیه و سلم)

**ئەو دەنگوباسی مەزن و ڕوداوی گەورەو هەواڵە سەرسوڕهێن و دۆزە مەزنەکە بو:**

﴿ عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ۝١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ۝٢ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴾:

لەچی لەیەکدی دەپرسن. لە دەنگوباسەکەی مەزن. کە لەبارەیەوە ناکۆکن[1].

هەواڵی پێغەمبەرایەتی محمد (صلی الله علیه و سلم)، گرنگترین و گەورەترین هەواڵی سەر زەمین بو. لە دنیادا بە هەزار ئاوازە دەنگی دایەوە، لە دیوەخانان گێردرایەوەو لە لادێ و شاران بە پەیك[2] و سواران بلاوکرایەوە. بەم هەواڵە جیهان دۆشداما، رۆژگار هەڵوەستەی کرد، رەوتی سەردەم گۆڕاو و مێژو وەرچەرخا. تاریکی نەیتوانی بەسەریدا ڕاشکێ، رەشەبا نەیتوانی بەسەریدا ڕاکشێ، تەمومژ نەیتوانی بنبزری کا، بگرە دەریاکانی بڕی و بیابانەکانی تێپەڕاند و بەتەواوی دنیادا گوزەری کردو لە ئاسمانان دەنگی دایەوە، وەکو بارانی پڕ لە میهرەبانی بەسەر جیهان داباری و وەك تاوی خۆر گزنگیدا. بەکورتی ئەو ڕوناکی بو، ڕوناکیش پەردەپۆش ناکرێ.

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾[3]

---

(١) (النبأ: ١-٣).
(٢) پەیك: نامەبەر.
(٣) (الصف - ٨).

ئەوان دەیانەوێ تیشکی خودا بەفوی دەمیان بکوژێننەوەو خوداش تیشکی خۆی هەر سەردەخا، ئەگەرچی بێبڕواکانیش پێ قەڵس و هەراسان بن.

**مثل ما بعثني الله به من الهدى والعلم كمثل الغيث**[1]

من و ئەو هیدایەت و زانستەی کە خوا پێی ناردوم وەکو بارانی پڕ بەرەکەت وایە.

*ئامەزانت هەزار جار لەسەر زار بە گشت ڕەنگێ*
*ڕیسوان، بێوەچن جا لەهەر کوێ بن و کەنگێ*
*لەبەر ڕازێکە خوا پێیبەخشیوی ڕێزو بەرزی*
*قسەی پوچ و نابەجێیە وەسفی تۆ بە ئامەزی*

ئەو (صلى الله عليه و سلم) بۆ ئەوە نێردراوە تا خوا بەبێ هاوەڵ و بەتاك و تەنیایی بپەرسترێ، تا خواوەندە ساختەکان لەناوبەرێ و خواناسیی ڕاستەقینە بێنێتەدی، تا مرۆڤ لەسەر زەمین دەنگ هەڵبڕن: خوا یەکە وتاقانەیە موحەممەدیش پێغەمبەری تا ئاخیر زەمانەیە، تا ڕاستی بچەسپێنێ و ناراستیش بچەپێنێ، تا دادگەری و چاکەکاری و خزمدۆستی بەرپا کاتەوە، تا خێروخۆشی و ئاشتەوایی و چاکەپەروەری و خۆشەویستی و ئاسودەیی و تەبایی و لەگەڵ یەکسازی و ئارامی و بڕواداری زندو کاتەوە، تا پاکژی و نوێژ و زەکات و ڕۆژی و حەج و جیهادو فەرمان بە کردنی چاکەو ڕێگرتن لە خراپە بەرپەیڕەو کا، تا بەهای بەرزو ڕەوشتی جوان و سروشتی چاك و هەڵوێستی پەسند بلاوکاتەوە، تا هاوەڵپەرستی هەڵوەشێنێ و بت و کۆتەلان تێکبشکێنێ، تا نەزانی هەڵتەکێنێ و لەگەڵ زوڵم و ستەم شەڕ هەلایسێنێ، تا ناهەقی لەبارەبەرێ و ئاکاری بەد بنەبڕ کا. نێردراوە و بەڵگەی ڕون و ڕەوان و ڕێوشوێنی پیرۆزو پێڕۆژینی پڕ ڕەحمەتی لەگەڵ خۆی هێناوە. خەڵکی بۆ خێرو چاکەکاری هەڵناوەو لە شەڕو خراپان وریایی داوە.

---

(١) أخرجه البخاري ٧٩، ومسلم ٢٢٨٢ عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه.

با بێینه سەر باسی ڕەوشتەکانی.. خوا پەروەردەی کردوە، پەروەردەیەکـی جوان و ڕێکوپێك، له هەمو کەس ڕەوشت و ئاکار جوانترو کار تەواوترو ڕاستەڕێترو هەواڵ وردترو قسە ڕاستترو حوکم دادترو سەرجێ پاکترو ڕێژین سافترو ڕەزا سوکترو دەرون نیانترو دڵنیاترو سینگ فرەوانترو بەتەقواتر و خۆپارێزترو دلاواترو زاناترو بەخزمایەتیترو ڕەسەنترو جوامێرترو بەجەرگترو خۆڕاگرترو بەڵگە حازرتر بو. باشترین کەس و دیندارترین کەس بو، خاوەنی چاکترین ڕەچەڵەك و باشترین ڕەوشت بو.

ئاکار ڕون و ڕوخسار جوان و خۆشەویستی ناو دلان بو، ڕوح شیرن و ڕەفتار نەرم و خاوەن ڕێبازی ساناو زاتێکی پیـرۆزو سادەو پڕ له خێرو بەرەکەت بو، هەیبەت و سامێکی گەورەی هەبو، ڕوناکایی پەیامەکەی لەنێوچەوانی دەباری، بزەی مەحەببەتی لەسەر لێوانی دەپشکوت، هۆشیارو دڵ زندو و بەزمین و زیرەك و ئاوەزو ڕازان و ڕاتەواو بو، هەست و نەستی له دێراوی خێرو چاکەدا تێراو بو، هاونشینانی دڵخۆش و هاوەڵانی دڵئارام و ڕەفیقانی بەختەوەر بون. له شنەبایان بەخشندەترو له ڕەهێلان بەرێژەوترو لەمانگی چواردە بەشەوقتر بو. خەڵك بەرەوشتە شیرنەکانی خەنی ببون، بەروح خۆشیان دەویست، پیاوان لەبەخشندەیی و جوامێری ئەودا سەریان سورما بون، مرۆڤایەتی بەسای بانگەوازەکەی خۆشبەختی بۆ گەڕایەوە. هەر کەسێکی بیدیبایە خۆشیدەویست، هەر کەسێکی بیناسیبایە سامی لێدەنیشت، هەر کەسێکی لەگەڵی بدوابایە هەیبەت دڵی دادەگرت. وتە بەچێژەکانی دلانی هەڵدەفڕاند، ئاکارەکانی بەپێزەکانی ڕوحیان دەبزواند.

خوا دڵی وا سەقامگیر کردبو بەهیچ کارەساتێ نەلەرزێ، ورەی هێندە بەرز ڕاگرتبو له هیچ ڕەوشێ دانەبەزێ، قسەی وا ڕون و ڕەوان کردبو هەرگیز هەڵەی تێنەخزێ، چاوی وا پاراستبو قەت نەتروکێن بە نزێ[1]، زمانی وا شیرن کردبو هەرگیز بەهیچ کەس نەچزێ، ئیمانی هێند پڕ لەوزەو هێز کردبو هەرگیز بەهیچ ڕانەخزێ، کاری هێند تۆکمە سازاندبو قەت تێینەکەوێ درزێ.

---

(١) گزی: خیانەت.

درودو سڵاوی خوای لەسەر بێ، پارێزراو و موبارەك و پیرۆزترین ئادەمی بو.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾[1]

بەراستی تۆ لەسەر خورەوشتێكی ئێجگار مەزنی.

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴾[2]

بەسای بەزەیی خواوە تۆ ئەوەندە لەگەڵیان نەرمی.

پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) دەفەرموێ:

إن أتقاكم وأعلمكم بالله أنا[3]

له هەموتان خۆپارێزتر و خواناستر منم.

خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهله[4]

باشترین كەستان ئەو كەسەیە بۆ خاوخێزانی باشترین بێ، منیش باشترینتانم بۆ خاوخێزانەكەی.

إنّما بعثت لأتـمّم مكارم الأخلاق[5]

بێگومان بۆ ئەوە نێردراوم تا رەوشتە بەرزو جوانەكان بەئاكام بگەیەنم.

پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی كە دەسنیشانی كردو هەڵیبژاردو سەرپەرشتیی كرد، كە چاودێری لێكردو راچاوی كردو پەرژینی كرد، هەروەها بە چاكترین شێوەش پەروەردەی كرد.

---

(١) (القلم - ٤).
(٢) (آل عمران - ١٥٩).
(٣) أخرجه البخاري ٢٠ عن عائشة رضي الله عنها.
(٤) أخرجه الترمذي ٣٨٩٥ والبيهقي في السنن عن عائشة رضي الله عنها.
(٥) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى ٢٠٥٧١

# دینـی محمد (صلی الله علیه و سلم)

دینەکەی ئیسلامە، دینی ماکزادی مەردومە، دینی رزگاری و سەربەخۆبونە. ڕاپسێنی تۆق و زنجیری گەردنانە، خۆشەویستترین ئاینی پەروەردگاری میهرەبانە:

﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾(١)

ئەوەی جگە لە ئیسلام پەیڕەو لەهەر دینێکی تر بکا، ئەوا هەرگیز لێی قبوڵ ناکرێ و لەرۆژی دواییشدا یەکێکە لە دۆڕاوان.

دینی نێوەنجیگرە، سادەو ئاسانیگرە، هەموەکی و گشتیگرە، تەواو و ڕاستیگرە:

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾(٢)

ئەمڕۆ دینم بۆ ئێوە تەواو کردو چاکەی خۆم بە تەواوی بەئێوە بەخشی و تەنها بە ئیسلام رازی بوم کە ببێتە دینی ئێوە.

دینێکە هاتوە خەڵك لەبەندایەتی بەندانەوە بەرەو بەندایەتی خوای بەندان،

---

(١) (آل عمران - ٨٥).

(٢) (المائدة - ٣).

لەبەرتەنگی دنیاوە بەرەو بەرفرەوانی دوایی، لەتاریکاییەکانی هاوەڵپەرستیەوە[1] بەرەو ڕوناکی یەکخواپەرستی، لە نەگبەتی بێباوەڕیەوە بەرەو ئاسودەیی ئیمان. ڕزگار بکات.

دینێکە شایەن بە هەمو کات و شوێنێکە، ئەو زاتە دایناوە کە لە هەڵخزینان خۆش دەبێ و بەئاشکراو شاراوەکان زانیارەو بەقسەو چرپەچرپی بەندەکانیش ئاگادارە.

ئەو دینەیە کە هەم زانستی سودبەخش و هەم کردەوەی چاکی لەگەڵ خۆ هێناوە. بەپێچەوانەی جولەکان کە خێوی زانستی پڕ سودو کار نەکردە بون، بۆیە کەوتنە بەر تورەیی خوا. بەپێچەوانەی گاورانیش کە کارکردەی بێ زانست بون، بۆیە وێڵ و گومڕا بون. کەچی دینی ئیسلام ڕاستەڕێی ئەو بەهرەوەرانەیە کە خوا بەهرەی پێبەخشیون و جیان لەوانەی کە بەرتورەیی کەوتون یا گومڕا بون. محمد(صلی الله علیه و سلم) ی پەیامبەری پلەبەرزی پایەداری نەخوێندەوار ئایەتەکانی خوای بەسەر بەهرەوەران دەخوێندەوەو لەچڵکی گوناح پاکی دەکردنەوەو فێری قورئان و دانایی دەکردن، هەرچەندە پێشتر بێهیدایەت و گومڕاش بون.

ئەم دینە هات فێڵ و درۆ و شایەدی بەدرۆ و تەرازوبازی و دەسدرێژی و ڕێگری و دادگاکردنی بەناهەقی و ستەمکاری لە دەسەلات و زیان لە خەڵکی دانی بە حەرام دانا. جەستەی بە هۆکارەکانی تەندروستی و دلانیشی بەسای بڕواوە پاراست، ماڵی لە بەخەساردان و ناموسی لە هەتککردن و خوێنی لە ڕشتن و ئەقڵیشی لە شێوان و بەربەرەڵلایی دور خستەوە.

# کتێبی محمد (صلی الله علیه و سلم)

کتێبەکەی قورئانە، باشترینی کتێبانە، بەرێزترینی بەڵگەنامانە، چاکترینی فەرمودەو سەربردانە. ئەو هەقە بەسامەیە کە ناهەقیی بە هیچ ڕوێ، نەیکراوەو بۆشی ناکرێ توخنی کەوێ.
پەرتوکی خوای کارزان و دانایە، ئایەتەکانی رون و ئاشکرایە، جێگیرو سەقامگیرن، دانسقەو بێ نەزیرن. خوێندنەوەی، تێڕامانی، شفاخوازی، پەیڕەوی لێکردن و دادوەری پێکردنی: فەڕی و پیرۆزی و نەزاکەتن، هێزو پێزو بەرەکەتن. خوێندنەوەی هەر پیتێکی (دە) چاکەیە. تکاکارو تکابەرە، شاهێدی هەق دەرخەرە، یاوەری دڵخۆشکەرە، هاودەمی سودبەخشەرە، هاوڕێی دڵ هێورکەرە، پەرجوی بەکاریگەرە. شیرین بەخشی نافانییە، تاموچێژی روحانییە. هیچ وتارێ بارتەقای ناباو دەرەقەتی نایێ، هەر خۆی زاڵی بالادەستە تاهەتایێ. نە شیعرەو نە جادوە، نە هیچی لەیاد چوەو نە هیچی بواردوە. نەوتەو قسەی مەردومە، نە هیچ کەس لێی مەحرومە. بەڵکو وتەی پەروەردگارە، لەنێو وتان بالاو دیارە. لەلایەن خوا دابەزیوە، ناحەز هەمیشە بەزیوە. پاك و پوختەو پارێزراوە، تاقێ وشەی نەگۆڕدراوەو کەم و زێدەی تێنەخراوە. تا ئەو رۆژەی نزیك دەبێ قیامەت هەڵسێ و خوا بۆ ئاسمان دەیباتەوە، هەر بەپاك و پیرۆزی دەمێنێتەوە.
ڕوحی ئەمین کە جبریلە، بە زمانێکی تەڕ و پاراوی عەرەبی دایبەزاندۆتە سەر دڵی دواهەمینی پێغەمبەران. ڕون و ڕەوان و پاراوە، لە هەلان پارێزراوە، پەرجوێکی جاویدانە[1]، قسەزانێکی لێزانە. بەڵگەکانی قسەبڕن، لەحیکمەت و

---

(١) جاویدان : تاهەتایی.

له پەند پڕن، ڕەحمەتە، ئامۆژگارە، ڕێنوێنیە، روناکیە، سەلمێنەرە، فێرکردنە، شیفای دڵ و دەرونانە. پارێزەری ئەوانەیە کە پەیڕەوی لێدەکەن، رزگارکەری ئەوانەیە کە کاری پێدەکەن. ئەوانەی دەیکەنە ڕێبەری خۆیان ئاسودەو بەختەوەرن، ئەوانەی ڕێنوێنی لاوەردەگرن سەرکەوتوی وەژێرخەرن، ئەوانەی ملکەچی دادی ئەون سەرفرازو خەلاتبەرن.

پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) فەرمویەتی:

اِقرؤوا القرآن فإنّهُ يأتي يومَ القيامة شفيعاً لأصحابه[1]

قورئان بخوێنن، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە تکاکاری یاوەرانی.

خيركم من تعلّم القرآن وعلّمه[2]

چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر ببێ و خەڵکیش فێر بکا .

إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواما ويضع به آخرين[3]

خوا بەم قورئانە هەندێ لە نەتەوان وەسەر دەخاو هەندێکیشیان وەژێر دەخا.

کتێبەکەی، ئەو قورئانەیە کە شاعیران لە ئاستیدا لێویان نەبزوت، وتاربێژان ورتەیان لا نەهات و متەقیان لابڕا، ڕەوانبێژان دەمکوت بون و بەزین، عارەبە ڕەسەنەکان چونە ژێر رکێفیەوە، زمانزانان زاربەستە بون و ڕەخنەیان پێنەگیرا، دانایان لە حزوریدا حەپەسان و زانایانیش شەیدا و سەرسام بون.

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ... ﴾[4]

ئەم قورئانە بۆ ڕاسترین ڕێ ڕێنوێنی دەکات.

---

(١) أخرجه مسلم، ٨٠٤ عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه.

(٢) أخرجه البخاري، ٥٠٢٧ عن عثمان رضي الله عنه .

(٣) أخرجه مسلم، ٨١٧ عن عمر رضي الله عنه .

(٤) (الإسراء- ٩).

# ڕاستگۆیی محمد (صلى الله عليه و سلم)

محمد (صلى الله عليه و سلم) ڕاستگۆترین ئاخێوەر بو، قسەی هەق و جێباوەڕ بو. لەژیانیدا نە بە جددی و نە بەگاڵتە درۆی لا نەبیسراوە، بەڵکو درۆی بە حەرام داناوەو درۆزنانیشی بەبەدو بەدفەڕ هەڵناوەو فەرمویەتی:

إنّ الصِّدقَ يهدي الى البِرِّ، وإن البرَّ يهدِي الى الجنة، ولا يزال الرَّجل يصدق ويتحرى الصِّدقَ حتّى يكتب عند الله صدّيقاً[1]

ڕاستگۆیی ڕێ نیشاندەری چاکەیە، چاکەش ڕێ نیشاندەری بەهەشتێیە، پیاو هەیە هەر بەڕاستی شتان دەڵێ و هەر سۆراخی ڕاستگۆیی دەکات، تا لەلای خوا بەراستگۆ ناونوس دەکرێ. درۆش ڕێ نیشاندەری خراپەیە، خراپەش ڕێ نیشاندەری دۆزەخە، پیاو هەیە هەر بەدرۆ شتان دەڵێ و هەر سۆراخی درۆیان دەکات تا لەلای خوا بەدرۆزن ناونوس دەکرێ.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) پێی ڕاگەیاندوین کە ڕەنگە بڕوادار دەستەنگ[2] و ترسنۆك بێ، بەڵام هەرگیز درۆزن نیە و درۆ ناکا. فەرمانیشی پێکردوین کە گاڵتەی درۆینە نەکەین بۆ خەڵك هێنانە پێکەنین.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بە درێژایی تەمەنی موبارەکی هەر ڕاستگۆیی خۆشەویست و هاوەڵی بو. ئەوەندە بۆ ڕاستگۆییەکەی بەسە کە بە

---

(١) الحديث أخرجه أبو داود ٤٣٥٩ والنسائي ٤٠٦٧ أخرجه البخاري ٦٠٩٤ ومسلم ٢٦٠٧ عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه.

(٢) دەستەنگ: ڕەزیل .

زانستی غەیبییەوە هەواڵی لەبارەی خواوە بەئادەمیزادان داوەو خوا پەیامی پێ سپاردوە، کە سەرجەمی بەبێ هیچ زیادی و کەمی بەم ئوممەتە راگەیاندوە، هەرچی خوداش رایسپاردوە ئەو بێکەموکورتی هەموی گەیاندوە.
سەرلەبەری وتەو کردەو رەوشەکانی لەسەر راستگۆیی بینا کرابو، لە شەڕو لە ئاشتیدا، لە ڕازیبون و تورەییدا، لە گاڵتەو لەراستیدا، لە رونکاری و دادوەریدا، لەگەڵ بێگانەو خزمیدا، لەگەڵ دۆست و دوژمنیدا، لەگەڵ پیاو و ژناندا، لەگەڵ خۆی و خەڵکاندا، لە ماڵێ و لەگەشتیدا، لەبەڵێن و پەیمانیدا، لەمەسرەتی و لەگرژیدا، لەفرۆشتن و کڕینیدا، لەنامەو وتاریدا، لەباسی سەربردەو را دەربڕینی، لەروداو گێڕانەوەو باسکردنی، لەهەواڵ و پەی پێ بردنی، هەر چەند بڵێی ڕاستگۆتر بو.
خوا لە ئاکاری ناشرین و دزێوی درۆ پاراستی و زمانی بە ڕاست و ڕەوانی گەڕاندو دەمڕاستیی پێبەخشی، راستگۆیەکی بەڕاستی بو، یەك پیتیشی بە ناڕاستی نەفەرموە، یەك وشەشی بەناهەقی نە گوتوە. دەرو دەرونی وەك یەك بو، تەنانەت لە سەرنج و واژەکانی[1]، لەئاماژەی چاوەکانی هەر راستگۆ بو. خۆشی فەرمویەتی:

ما كان لنبـيّ أن تكون له خائنة أعين[2]
پێغەمبەر نابێ تیلکە چاوی گزی باوێ[3].

لەلای خواوە بە ڕاستگۆیی نێردراوە، و رێوشوێن و قسەکانی، تورەبون و رازیبونی، مانەوەو گەشتەکانی، گریان و پێکەنینی، واگایی و نوستنی.. هەموی هەر بەراستگۆیی بون.

---

(١) واژە: لفظ .

(٢) ئەمەی لەم کاتە فەرموە کە یاوەران، لەبارەی بێباوەرێکی تاوانکارو سەرسەختەوە کە وەبەر لێبوردنی پێغەمبەر نەکەوتبو ء بەدیل گیرابو، پێیانگوت: ئەی خۆشەویست هەر بەچاو ئاماژەیەکت بۆ کردباین تا دەسبەجێ سەریمان پەل دابایە!

(٣) أخرجه أبو داود ٤٣٥٩ والنسائي ٤٠٦٧ .

﴿لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ﴾[١]

تا لەراستان لەبارەی راستیەکان پرسیار بکا.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾[٢]

بڕواداران! لەخوا بترسن و لەگەڵ گرۆی راستاندا بن.

﴿فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾[٣]

ئەگەر ئەوسا لەگەڵ خوا راست بن هەر بە قازانجی خۆیانە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لەگەڵ خوای راستگۆ بو، لەگەڵ خۆی ڕاستگۆ بو، لەگەڵ خەڵکی راستگۆ بو، لەگەڵ خزمان راستگۆ بو، لەگەڵ دوژمنان راستگۆ بو. ئەگەر راستگۆیی پیاوێك بوایە ئەوا محمد (صلى الله عليه و سلم) بو. ئەو سەرچاوەی فێربونی راستگۆییە، راستگۆیی لەویەوە سەرچاوە هەڵدەبەستێ، ئەو بەر لەئیسلام بەراستگۆی دەسپاك نێوبانگی دەرکردبو، جا ئایا دەبێ دوای سروش و رێنوێنی و دابەزینی جبریل و بە پێغەمبەربون و دەسنیشانکردن و هەڵبژاردنی لەلایەن خواوە، چ راستگۆیەکی لا دەرچوبێ!

---

(١) (الأحزاب - ٨).
(٢) (التوبة - ١١٩).
(٣) (محمد - ٢١).

# ئارامگرتنی محمّد (صلی الله علیه و سلم)

کەس نەبوە هێندەی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) توشی بەلاو خاکەساری[1] و ئاستەنگ و دەردەسەری هاتبێ، بەڵام ئەو هەر ئارامی گرتوەو چاوی هەر لەپاداشتی خودا بوە.

﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾[2]

ئارام بگرە، دیارە ئارامگرتنیش هەر بە خودایە.

لەسەر یەتیمی و هەژاری، لەسەر نەبونی و نەداری، لەسەر پێویستی و ماندویی، لەسەر ئازارو ئێرەیی[3]، لەسەر جوێندانی خەڵکی و جارجارەی زاڵبونی دوژمنانی.. ئارامی گرت.
لەسەر پەرگەندەیی و ئاوارەیی و دورخستنەوەی لە خزمانی، لەسەر کوشتنی نزیکانی و بوختانکردن بەیارانی و پەرتکردنی پەیڕەوانی و گەلەکۆمەی دوژمنانی و یەکگرتنی ناحەزانی. ئارامی گرت.
لەسەر کۆبونەوەی شەڕکەران و هەرموەزی دڵڕەشان و لوت بڵندیی سەرسەختان و مێشك وشکیی دەشتەکیان و فڕوفێڵی دوژمنان و سەرسەختی گاوران و دڵڕەشیی دوڕوان و شەڕوشۆڕی شەڕندان و دڕودۆنگی خزموکەس و پەلاماری بێگانان و هێرشی ناهەقیان و دەسدرێژی خوانەناسان. ئارامی گرت.

---

(١) خاکەساری: بەدبەختی، کلۆڵی.
(٢) (النحل- ١٢٧).
(٣) ئێرەیی: حەسودی.

لەسەر دنیاو جوانی و گەشیی، لەسەر زێرو زیو و خۆشی ئارامی گرت و خۆی بۆ هیچیان شەیدا نەکرد.
لەسەر تەماحی سەرۆکایەتی و حەزو ئارەزوی دەسەلاتداری ئارامی گرت و لەپێناو رەزامەندی پەروەردگاری، خۆی لەهەمویان هەڵبواردو هیچی نەخستە بەردڵی.
پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەگشت کاروبارەکانی ژیانی ئارامگر بو. ئارامگری، زرێپۆش و مەتاڵ و هەڤاڵ و هاوپەیمانی بو. کاتێ دوژمنان بەوتەی نابەجێ و بەقسەی ناشیرین هەراسانیان دەکرد، ئەم ئایەتەی وەبیرخۆ دێنایەوە.

﴿ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾[1]
لە هەرچی ئەوان دەڵێن ئارام بگرە.

کاتێ رەوشی دژوار دەبو یا کە توشی ئاستەنگێ دەهات، ئەم ئایەتەی وەبیر خۆ دێنایەوە:

﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞ ﴾[2]
ئارامێکی جوانت هەبێ.

کاتێ دوژمن گۆبەندێکی دەنایەوە، یا پیلانێکی دەگێڕاو بۆسەی بۆ دادەنایەوە، ئەم ئایەتەی وەبیر خۆ دێنایەوە:

﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾
وەك پەیامبەرە خۆڕاگرەکان ئارام بگرە[3].

---

(١) (طه - ١٣٠).
(٢) (یوسف - ١٨).
(٣) (الأحقاف - ٣٥).

ئارامی ئەو، (صلى الله علیه و سلم) ئارامێکی پڕ لە متمانە بو بەسەرخستنی خوایی، پڕ لە دڵنیایی بو بە بەڵێنی خوایی. پەنای وەبەرخودا دەبرد، لە پاداشتی خوای هەڵدەڕوانی. ئارامی ئەو، ئارامی کەسێك بو کە دەیزانی گومانی تێدا نیە خوا سەری دەخاو خوا لەگەڵیەتی و دوارۆژ هەر بەقازانجی ئەو دەشکێتەوەو یارمەتی خوداش سەروی هەمو شتێکە.

لە تەوس و تانەی ناحەزان ئارامی دەگرت و پێ نەدەهەژا، لەسەر پلارو وتەی پوچان ئارامی دەگرت و نەدەشڵەژا. لەسەر ئەزیەتی بەئەنقەست ئارامی دەگرت و کۆڵی نەدەدا.

مامی مرد ئارامی گرت. خێزانی مرد ئارامی گرت. حەمزە کوژرا ئارامی گرت. لەمەککە دور خرایەوە ئارامی گرت. جگەرگۆشەکەی مرد ئارامی گرت. بوختان بەخێزانە پاکیزەکەی کرا ئارامی گرت. بڕوایان پێنەدەکرد ئارامی گرت. پێیان دەگوت جادوگەرە، شاعیرە، شێتە، درۆزنە، قسە هەڵبەستە، ئارامی گرت. پەرگەندمیان کرد، ئازاریان دا، جوێنیان پێدا، قسەی سوك و پوکیان پێگوت، دژایەتیان کردو گەمارۆیان دا، بەڵام ئەو هەر ئارامی گرت.

ئارامگری لەکێ فێر بین گەر لەو نەبێ؟ بۆ ئارامگری چاو لەکێ کەین لەو نەبێ؟

ئەو (صلى الله علیه و سلم) نمونەی سینە فرەوانی ئارامگری و خۆڕاگری و کۆڵنەدانە، پێشەوای ئارامگران و سوپاسوێژانە.

# جوامێریی محمد (صلی الله علیه و سلم)

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەناو ئەفریدەکانی پەروەردگاردا بڵندترین کەس بو لە ڕێزو شکۆداری، بەدڵترین کەس بو لە جوامێری و بەخشینکاری، دەستی پیرۆزو جوانی وەك بارانی میهرەبانی خێرو چاکەی لێدەباری. بەدەستوبردو خێرا بو لە بەخشین و لە خێرکاری، بگرە لەبای شەماڵیش خێراتر بو سەدان جاری. خۆ قەت نەیگوت " نا " مەگەر بۆ یەکتایی پەروەردگاری.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) هەمیشە دەیبەخشی بێئەوەی بترسێ لە هەژاری، چونکە بۆ چەسپاندنی ڕەوشتی شیاو و مەردانە نێردراوە. سەروەری مەردو جوامێران بو، مێگەلەمەڕی بەخشیوە کە بەپڕایی دۆڵێك دەبون، سەد سەدوشتری بەسەرەك هۆزان داوە، سواڵکەر داوای بەرگی بەری لێکردوە، لەبەری کردۆتەوەو پێیداوە. داوای داواکارانی ڕەت نەکردۆتەوە، چاکەکانی هەمو خەڵکی گرتۆتەوە، خوان و خۆراکی بۆ هەمو کەس ڕاخرابو، دڵفرەوان و ڕەوشت شیرن و روگەش و شاد بو.

هەژاریش بو هەر خەرجی دەکردو دەیبەخشی، کە غەنیمەی وەدەست دەکەوت هەر دەسبەجێ دەیبەشیەوەو هیچی بۆ خۆی گل نەدەدایەوە، خوانی بۆ میوانان ئامادە بو، ماڵی روگەی ڕێبواران بو، بەشەنانی خۆی بۆ میوانان دادەنا، پارەوپولی پێویستی خۆی و چی لەدەست بایە دەیدایە نزیك و نەداران، لایەیدەی رادەگرت و خزمەتێکی چاکی دەکرد.

پێغەمبەر(صلی الله علیه و سلم) هێمای جوامێری بو، جوامێرترینی جوامێرانی وەکو حاتەمی تایی و هەرەمی کوڕی جەدعان تۆزی ڕێگەشیان نەشکاندوە، ئەو کە دەیبەخشی بۆ خوای دەبەخشی و پاداشتی لەخوا دەخواست، جوامێریەکەی بەم جۆرە بو کە ئەگەر لەرێی خوادا نەفسی خۆشی یا سەرباکی پارەوپول و پێداویستەکانی ژیانیشی بکردایە قوربانی باکی نەبو.

له هەمو خەڵکی بەرچاو تێرترو دەستکراوەترو بەخشندەتر بو، یارو خۆشەویست و پەیڕەوانی لەبەخشندەیی ئەودا خەنی ببون، تەنانەت دوژمنان و ناحەزانیش لەخێرو چاکەو پیاوەتی و نانبدەیی و دەهندەیی و دلاوایی و جوامێری ئەودا بێبەش نەبون. دەوارنشین و جولەکەو تەنانەت دوڕوەکانیش لەسەر سفرەی دانیشتونەو نان و شیویان خواردوە.

نەبینراوەو نەبیسراوە کە لە میوانان بێزار بوبێ، یا لە سواڵکەرێ دڵپەست بوبێ، یا لە خوازیارێ دڵتەنگ بوبێ.

جارێکیان سەحرانشینێ یەخەی عەباکەی رادەکێشێ . گەردەنی موبارەکیشی دەڕوشێنێ . دەڵێ: بێنە لەو پارەیەی کە هی خوایەو لەلای تۆیە نەك لەپارەی دایك و باوکت شتێکم بدێ، ئەویش (صلى الله عليه و سلم) بە پێکەنینەوە ئاوڕی لێدەداتەوەو دەیداتێ.

چەندین گەنجینەی زێرو زیوی بەدیاری بۆ هاتوە کەچی هەر لەو مەجلیسدا گشتی بەخشیوەو درهەمێ یا دیناری یا پارچەیەکیشی بۆخۆی هەڵنەگرتوە. کە دەیبەخشی لەوەرگرەکە دڵخۆشتر بو، فەرمانی بە موسڵمانان دەکرد کە دلاواو دەهندەو یارمەتیدەر بن، هانی دەدان جوامێرو بەرچاوتێرو پیاوانە بن، لە دەستەنگی و بەرچاوتەنگی و رژدو رەزیلی وەدور بن. دەیفەرمو:

من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه[1]

ئەوەی بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با رێزی میوانی بگرێ.

كل امرئ في ظل صدقته حتى يفصل بين الناس[2]

هەمو کەس لەبەر سێبەری خێرو بەخشینەکانیەتی، تا ئەو ڕۆژەی هەق و حیساب یەکلا دەکرێنەوە.

ما نقَصت صدقة مِن مالٍ[3]

خێرو بەخشین ماڵی کەم نەکردۆتەوە.

---

(١) أخرجه البخاري (٦٠١٨، ٦١٣٦، ٦١٣٨)، ومسلم، ٤٧ عن أبي هريرةرضي الله عنه

(٢) أخرجه ابن خزيمة في صحيحه ٢٤٣١، وابن حبان في صحيحه ٣٣١٠.

(٣) أخرجه مسلم ٢٥٨٨ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

# ئازایەتی محمد (صلی الله علیه و سلم)

بەچاو دیویانەو بەگوێ بیستویانەو دەماودەمیش بەراست و ڕەوانی بەئێمە گەیشتۆتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە هەمو خەڵکی بەجەرگترو ئازاتر بوە، وەك شاخ چەسپیوەو نەلەخشیوەو نەلەرزیوە، لەهەڕەشەو گەفوگوڕان نەترسیوە، لەناستەنگ و لە قەیرانان نەشڵەژیوە، لە کارەسات و لە پێشهاتان نەتۆقیوە. بێباك بو، چونکە خۆی تەسلیمی خوا کردبو، خوا پشت و پەناو سەرخەری بو، بە بڕیاری خوا ڕازی بو، بەبەڵێنی خوا دڵنیا بو، ئەوەندەی متمانەی بەخوا هەبو بای نەتەوەیەکی دەکردو لە لەشکرێکیش سەرڕێژ دەبو.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) خۆی دەچوە مەیدانی شەڕێ و بەژداری شەڕی دەکرد، لەگەڵ مەرگ ڕوبەڕو دەبوەوەو خۆی بۆ قوربانی ڕاپێش دەکرد. ترسی نەبوەو سام داینەگرتوە، لە شەڕ دوانەکەوتوەو ڕاینەکردوە، لە وەختی بەرەنگاربونەوەدا پشتی هەڵنەکردوەو چۆکی بۆ دوژمن دانەداوە. لەو وەختەی کە شەڕ لەوپەڕی گەرمیدا بوەو شیرو تیر لێك سواون و سەرو سەکوت هەڵپژاون و دەست و پێ و گەردەن پەڕێنراون و رم لە کەللەی سەر شکاون و مەرگ ئاهەنگی گێڕاوە، نەپەشۆکاوەو نەشێواوەو هەنگاوێکیش پاشەکشەی نەکردوە، بگرە لەهەمو یارانی لەمەترسی نزیکتر بوە. بەڵکو یاران خۆیان لەپەنای ئەو ناوەو ئەویش دلێرانە داڵدەی داون و لە ڕوی هێرشبەران ڕاوەستاوە. ژمارەی زۆری دوژمنانی پێ هیچ بو، دوژمن بەهێزیش بوایە لای گرنگ نەبو، ریزەکانی ڕێکدەخست و هانی شەرکەرانی دەداو دەچوە پێشی پێشەوە. بەڕاستی ئەمە لوتکەی خۆڕاگری و ئەوپەڕی ئازایەتیە.

ئەوەندە بەسە ئازایەتی ئەو پێغەمبەرە بسەلمێنێ کاتێك کە لەگەڵ ئەبوبەکر لە

ئەشکەوتێ خۆیان حەشاردابو بێنەوەی چەکیان پێبێ، بێباوەڕانیش بەشمشێری ڕوت و دڵی پڕ لەقینەوە دەروازەیان لێگرتبون و بەهەر نرخێك بوایە دەیانویست سەری پەلدەن! بینی ئەبوبەکر لەبەر ئەو ترسی کەوتۆتە دڵی و پەشۆکاوە، فەرموی:

یا أبا بکر، ما ظنّكَ باثنين اللهُ ثالثُهما[1]

ئەبوبەکر چۆنی لێتێدەگەی کە ئێمە دوانین و خواش سێهەممان بێ!

لە جەنگی حونەینیشدا کاتێ موسڵمانەکان خۆ ڕاناگرن و هەڵدێن و هەریەکەی بە لایەکدا پەرت دەبێ، تەنها شەش کەسی لەگەڵدا دەمێنێتەوە، بەناوی خوا مشتێ خۆڵ هەڵدەگرێتەوەو بەسواری ئەسپەکەیەوە لە لەشکری بەزەبرو زەنگ و پڕچەکی دوژمنان دەچێتە پێشەوە، لە مەیدانی گەرمی شەڕێ کە پاڵەوانان دەکەوتنە بەردەست و پێ و سەرو کەللەدەپەڕین، هەڵمەت دەباو سینگی دەداتە بەر شیرو ڕم، شالاو دەباتە سەر دوژمن، بەسەریاندا دەیپرژێنێ و دەفەرموێ:

شاهَتِ الوجوُه[2]

دزێو بێ ئەو دەموچاوانە.

خوای پەروەدگاریش ئەم ئایەتە دادەبەزێنێ و دەفەرموی:

﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾[3]

لەپێناو خوا بجەنگێ، تۆ هەر ئەرکی خۆت لەسەرەو هانی براوادارانیش بدە.

*لە ڕوی دوژمن ڕاوەستای بە نەبەردی*
*کەس نەبو بەتۆ بگا لە مەردی*
*باکت نەبو بە مەرگ و برینداری*
*کۆک نابن، ترس و نیگای ڕزگاری*

---

(١) أخرجه البخاري (٣٦٥٣، ٤٦٦٣)، ومسلم ٢٣٨١ عن أبي بكر رضي الله عنه.
(٢) اخرجه مسلم ١٧٧٧ عن سلمة بن عمرو بن الاكوع رضي الله عنه.
(٣) (النساء - ٨٤) .

له شەڕی ئوحد روی موبارەکی بریندار کراوەو دانی کەڵبەی شکێنراوەو حەفتا یاری لێکوژراوە، ئەوجاورەی نەڕوخاوەو ئەژنۆی نەشکاوە، بەڵکو بەخۆ بەشمشێرەوە وەکو شێر لەمەیدانێ ماوەتەوەو گیان لەسەر دەستانە چۆتە پێش و خۆی سەرکردایەتی شەڕەکەی کردوە. ئەو پێشی هەموکەس وەڵامی بانگی جیهادی دەدایەوە، بەڵکو هەر خۆی بەرپایکردوەو خەڵکی بۆ هەڵناوە.

له شەڕی ئەحزاب دوژمنان لەهەمو لاو لەگشت شوێنێ یەکیان گرت، شالاویان هێناو چوار دەوریان گرت، کارەسات راساو دلان وەلەرزە کەوتن و هەزارو یەك بەدگومانی بەخوا بردرا، بڕواداره بەهێزەکانیش بڕوایان کەوتە لەقین، ورەیان ڕوخاو له بێهومێدی چەقین. بەڵام پەیامبەری بەجەرگ هەڵسایەوەو دایبەستا نوێژ و لەخوا پاڕایەوە، کە سەری بخاو دوژمنانی لەپێ بخاو نەخشەیان هەڵوەشێنێ، زەبون و سەرشۆڕیان کاو ڕەشەبایان لێ هەڵکا، سەربازانی پەروەردگار لەئاسمانێ بێنە خوارێ و دڕ بە دوژمنان دەن و لەناویان بەرێ. خوا یارانی بەسەر کردەوەو بێباوەڕان رەنجەڕۆ بون و مەشخەڵیان کوژایەوەو بەس سەرشۆڕییان بۆ مایەوە.

پێغەمبەر، له شەوەکەی شەڕی بەدر کە خەڵك گشتی نوستبون، خەو بە چاوانی نەکەوت و هەڵسایەوە، بۆ یارمەتی باوەڕداران و سەرکەوتنیان بەسەر دوژمن لەخوا دەپاڕایەوە. ئای کە پێشەوایەکی چەند دلێر بو، کەس نەیتوانیوە لەئاست تورەییەکەی خۆی راگرێ، کەس نەبوە وەك ئەو دڵقایم و ورەبەرزو خۆڕاگر بێ، بەجەرگ و قارەمان و مەردێکی بێوێنە بو. سەرجەم ئاکارەکانی بەجەرگ و نەبەردانە بو، تەواوی سیفەتەکانی ئازایەتی بو، خۆی فەرمویەتی:

والّذي نَفسي بيدِهِ لوَدِدتُ أنّني أُقتلُ في سبيل الله ثمّ أحيا ثمّ أقتل[1]

سوێند بەخوا، حەزم دەکرد لەپێناوی خوا بکوژرابام و زندوبامەوە، پاشان دیسان بکوژرابامەوە.

---

(١) أخرجه البخاري (٣٦،٢٧٩٧) ومسلم ١٨٧٦ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

# دنیا بەکەمگرتنی محمد (صلی الله علیه و سلم)

دنیا بەکەمگریەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دنیا بەکەمگرتنی کەسێ بو، کە زانیویەتی دنیا بنی دێ و بە خێرایی دەگوزەرێ و توێشو کەمەو تەمەن کورتە، کە زانیویەتی ئاخیرەت بێکۆتایەو بەهەشتیش پڕ لە عەیش و نۆشی بێسنورەو پاداشتی خوا بێژمارو ژیانی دواییش تاهەتایە. ئەو (صلی الله علیه و سلم) هەر هێندەی لە دنیا وەرگرت کە برسیەتی لابەرێ و باری راست بکاتەوە، نەك بڵێی بۆی نەلوا بێ و نەیتوانیبێ بەدەستی بێنێ، بەڵکو هەمو دنیای بۆ بەدیاری خرابوە پێشی، تەنانەت ئەگەر مەبەستی بوایە تەواوی شاخانی ئەم دنیایەی بۆ دەکرایە زێرو زیو. بەڵام ئەو، دنیای بەکەم گرت و پتر لەبەشی پێویستی هەڵنەبژارد.

گەلێجاران بەبرسێتی ماوەتەوە، ماوەی مانگێك شیویان نەهاویشتۆتە سەر ئاگری، گەلێجاران ڕۆژ و شەوی بە برسیەتی بردۆتە سەرێ و تەنانەت خورمای خراپوچکەشی وەچنگ نەکەوتوە بیخوات. جاریش هەبوە سێ شەوانی لەسەر یەك بەس نانی جۆی خواردوە، بەڵام بە تێریش نا. لەسەر پارچە حەسیر نوستوەو نەخشی حەسیرەکەی لەسەر کەلەکەی[1] نەخشاوە. لەبەر برسیەتی بەردی وەبەر زگی ناوە. یاوەران برسێتیان لە ڕوخساری پاکی وەدیکردوە.

خانوەکەی لە قوڕ دروستکرابو، ڕوبەرێکی فرەوانی داگیر نەکردبو، بانەکەی نەوی بو. لەبری سێ چنگە جۆ زرێپۆشەکەی لەلای جولەکەیەك بە بارمتە داناوە، گەلا جار هەر کراس و عەبایەکی لەبەر کردوە، زۆرجاران یاوەران

---

(١) کەلەکە: کەمەر.

خواردنیان بۆ ناردوه چونکه زانیویانه بێ خواردنن. ئەم هەمو نەبونی و ئازارەی بۆیە دیوە تا بە چڵکی دنیا دژون نەبێ و ڕوحی بەپاك و پاراوی بمێنێتەوەو دینداریەکەی بپارێزێ و پاداشتەکەی لێوان لێو بێ و بەڵێنی خوای بۆ بێتە دی کە فەرمویەتی:

﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾[1]

پەروەدگارت چاکەی وات لەگەڵ دەکا پێی ڕازی بی.

پارەوپولی خۆی بەسەر خەڵکی دابەش دەکردو درهەمێکیشی پاشەکەوت نەدەکرد، وشترو چێڵ و مەڕو مالاتی بەسەر یاوەران و پەیڕەوان و نەوموسڵمانان دابەش دەکردو هیچی بۆ خۆی گل نەدەدایەوە، بەڵکو دیفەرمو:

لو كان لي كعضاة - أي شجر - تهامة مالاً لقسمته ثمّ لا تجدوني بخيلاً ولا كذاباً ولا جباناً[2]

ئەگەر بەقەد گەلای دارەکانی مەککەش پارەو پولم هەبوایە، ئەوا هەموم دەبەخشی و پاشانیش نە بەرەزیلی و نە بە درۆزنی و نە بە ترسنۆکیش منتان نەدەدی.

*بتویستایە بە ئەمری پەروەردگاری*
*شاخ و داخ دەبونە زێڕ و مرواری*
*کەچی بەندەییت هەڵبژاردو ئەوی*
*هەتبو کردتە قوربانی هەژاری*

خۆشەویست (صلى الله عليه و سلم) لەبارەی ئاخیرەتخوازی و دنیانەخوازی و بەهەند هەڵنەگرتنی دنیاو دڵپێخۆشنەبون و چێژلێوەرنەگرتن و نازونوزنەکردن بەخۆشیەکانی، پێشەنگێکی مەزن بو.. کۆشك و تەلاری هەڵنەنا، پارەوپولی دانەنا، گەنجینەی کۆنەکردەوە، باخوباخاتی نەبو لەبەریان بخوا، چ بێستان و

(١) (الضحى- ٥).

(٢) أخرجه مالك في الموطأ ٩٧٧، والطبراني في الأوسط ١٨٦٤ والكامل لابن عدي ٩٧١٣.

زەوی و زارێکی بۆخۆی گل نەدایەوە. فەرمویەتی:

لا نورّث، ما ترکناه صدقة [1]

ئێمە میرات ناگرین و ئەوی بەجێشی دێلین خێرو خێراتە.

ئەو بە وتەو کردەوەو باری، بانگەوازی بۆ دنیانەخوازی و خۆ تەیارکردن و کارکردن بۆ رۆژی دوایی و ئاخیرەتخوازی دەکرد.
ئەو (صلی الله علیه و سلم) پێشەوای موسڵمانان و سەرکردەی بڕواداران و باشترینی خەڵکان بو، کەچی لە خانوێکی قوڕ دەژیاو لەسەر پارچە حەسیرێکی پەڕپوت دەنوست و سۆراخی چەند دەنکێ خورمای دەکرد، تا بەس لەسەر پێ خۆی راگرێ، بگرە گەلا جار هەر تەنها چەند قومێ شیری خواردۆتەوەو هیچی تری نەبوە بیخوا.
ئەو لەنێوانی (پێغەمبەرێکی پاشا) یا (پێغەمبەرێکی بەندە) سەرپشك کرا، کەچی دوەمیانی هەڵبژارد، ئیتر بە زگێ تێرو بەسەد زگ برسی ژیانی بەسەر برد، تا بەدیداری خوا گەیشتەوە.
یەکێك لە ئاکارەکانی دنیا بەکەمگرتنی بریتی بو لەجوامێری و دلاوایی وەك پێشتر باسمان لێکرد. پرسی پرسخوازان و داوای داواخوازانی ڕەت نەکردۆتەوەو پێویستخوازانی بێهیوا نەکردوە، هەواڵی پێداوین کە دنیا سەنگی باڵە پێشولەیەکیشی نیە، هەروەها فەرمویەتی:

كُن فی الدنیا كأنّك غریبٌ او عابرُ سبیلٍ[2]
لە دنیادا وەك نامۆ یا وەك ڕێبوارێ بە.

ازهد في الدّنیا یحبك الله، وازهد فیما عند الناس یحبّك الناس[3]

---

(١) أخرجه البخاري (٣٠٣٩، ٣٧١٢) ومسلم برقم ١٧٥٨.
(٢) أخرجه البخاري ٦٤١٦ عن ابن عمر رضي الله عنهما.
(٣) أخرجه ابن ماجه ٤١٠٢ والطبراني في الكبير ١٠٥٢٢ والحاكم ٧٨٣٣ عن سهل بن سعد الساعدي.

دەست لەدنیا هەڵگرە خوا خۆشتی دەوێ، لەو شتانەی لای خەڵك هەن و پێیان گرنگە دەست هەڵگرە خەڵك خۆشیان دەوێ.

مالي وللدنيا، إنما مثلي ومثل الدنيا كمثل رجل قال في ظل شجرة ثم قام وتركها [١]

من چیم لە دنیایە! نمونەی من و دنیا وەك نمونەی کەسێکە، کە لەبن دارێ سەرخەوێ بشکێنێ و و پاشان هەڵسێ و بەجێی بێڵێ.

الدنيا مَلعونة، ملعون ما فيها إلاّ ذكر الله وما والاهُ وعالماً أو متعلماً [٢]

دنیا نەفرەتبارە، هەرچی لەناویشیەتی هەر نەفرەتبارە، تەنها یادی خواو ئەو شتانەی لا بترازێ کە لەپێناو خوان یاخود زانان یا فێرخوازن.

ليس لك من مالك إلا ما أكلت فأفنيت، أو لبست فأبليت، أو تصدّقت فأمضيت[٣]

ماڵەکەت هەر ئەوەندەیە کە خواردوتەو لەناوت بردوە یا لەبەرت کردوەو دڕاندوتە یا بەخێری خودا بەخشیوتەو بۆ ڕۆژی قیامەت ناردوتە.

---

(١) أخرجه أحمد (٣٧٠١، ٤١٩٦) والترمذي ٢٣٧٧، وابن ماجه ٤١٠٩ عن عبدالله بن مسعود وقال الترمذي حسن صحيح.

(٢) أخرجه الترمذي ٢٣٢٢ وابن ماجه ٤١١٢ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

(٣) أخرجه مسلم ٢٩٥٨.

# خاكەڕایی محمد (صلی الله علیه و سلم)

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) خاكەڕاییەكی ئەوتۆی هەبوە كە جێی سەرسوڕمانی گشت كەسێك بێ. خاكەڕایی ئەو خاكەڕایی كەسێ بوە كە خوای بە خاوەن سام و شكۆ ناسی بێ و شەرمی لێبكاو بە مەزنی زانیبێ و دڵی پێ ئارام بوبێ . كە زانیبێتی پشت و پارەوپول و دەسەلات لەئاستی گەورەیی ئەودا، شتی چەند بێهودەو بێسەنگ و بودەڵەن . كە گەشتێكی روحانی بۆ لای پەروەردگاری كردبێ و دڵی بۆ رۆژی كۆتا كۆچی كردبێ و لەگەڕانەوەشیدا شتێكی وای لەگەڵ خۆی نەهێنابێتەوە خەڵكی دنیاخواز پێی سەرسام بن، بەڵكو بوبێتە بەندەیەكی ڕاست و ڕەوانی پەروەدگاری و لەئاست برواداران خاكەڕایی بنوێنێ، لەگەڵ پیران هەڵوەستە بكا، سەردانی نەساغان بكا، لانەوازان بەسەر كاتەوە، لاوازان دڵ بداتەوە، بەزەیی بە هەژاراندا بێتەوە، گەمە لەگەڵ مندالان بكا، گاڵتە لەگەڵ خاوخێزانی بكا، لەگەڵ نەتەوەكەی گفتوگۆ بكا، لەگەڵ خەڵك نان بخوا، لەسەر خۆڵ دابنیشێ و لەسەر خاكی تەرو شێدار بنوێ و لەسەر لم پاڵكەوێ و پارچە حەسیرێ بكاتە سەرینی. هەروەها بە بەشی خوا رازی بێ و چاو نەبڕێتە نێوبانگ و بەناواتی كۆشك و تەلاران نەنوێ و تەماحی دنیای نەبێ. هەروەها بە نەرمی لەگەڵ ئافرەتان قسە بكاو خۆشەویستانە لەگەڵ نامۆیان بدوێ، لەگەڵ خەڵك كەیفسازو تەبا بێ و لەروی هاوەلانیدا دەم بەخەندە بێ و بفەرموێ:

إنما أنا عبد: يّكل كما يأكل العبد واجلس كما يجلس العبد [١]

منیش بەندەیەكم، ئەوەتانێ وەكو بەندە نان دەخۆم و دادەنیشم.

---

(١) أخرجه ابن أبي عاصم في الزهد٦\\١،وابن سعد في الطبقات٣٧١\\١وانظر كشف الخفاء ١٧٨١

جارێكیان پیاوێك ئەوی بینی و سامێكی گەورەی لا نیشت و جەستەی وەلەرزە كەوت و زۆر شلەژا، بەڵام پێغەمبەر(صلی الله علیه و سلم) فەرموی:

هوّن عليك، فإني ابن امرأة كانت تاكل القديد بمكة [1]

هێور بەوە، من كوڕی ئافرەتێكم كە لە مەككەدا گۆشتی وشكهەلاتوی دەخوارد.

ئەو رقی لە پێداهەڵگوتن دەبوەوەو نەیهێشتوە لە مەدحكردنیدا سنور ببەزێنرێ و زێدەرەوی بكرێ و فەرمویەتی:

لا تطروني كما أطرت النصارى عيسى بن مريم، فإنما أنا عبدالله ورسوله، فقولوا عبدالله ورسوله [2]

وەك دیانەكان هێندەم بەسەردا هەڵمەڵێن كە بەعیسای كوڕی مەریەمیان هەڵگوت، من هەر تەنها بەندەو نێردراوێكی خوام و هیچی تر، پێشم بڵێن بەندەو پەیامبەری خوا.

نەیهێشتوە كەس لەبەری هەڵسێتەوە یا لەبەری لەسەر پێ بوەستن، ریزی مەجلیس لەكوێ كۆتایی هاتبا لەوێ دانیشتوە، لەگەڵ خەڵكی تێكەڵ بوەوەك یەكێك بێ لەوان بێ جیاوازی، وەلامی بانگێشتی داوەتەوەو فەرمویەتی:

لو دعيت الى كراع لأجبت، ولو أهدي إليّ ذراع لقبلت [3]

ئەگەر بۆ پێچك (قاچ)ێكیش بانگێشتم بكەن هەر دەچم و ئەگەر باڵ (پەل)ێكیشم بۆ بكەن بەدیاری وەریدەگرم.

---

(١) أخرجه ابن ماجه ٣٣١٢، والحاكم ٤٣٦٦ عن ابن مسعود، وانظر الكامل لابن عدي ٢٨٦\٦.

(٢) أخرجه البخاري ٣٤٤٥ عن ابن عباس رضي الله عنهما.

(٣) أخرجه البخاري [٢٥٦٨، ٥١٧٨].

هەژارانی خۆشویستوە، لێی دەگێرنەوە کە فەرمویەتی:
اللهم أحيني مسكينا وأمتني مسكينا، واحشرني في زمرة المساكين [١]
خوایە بە هەژاری بمژێنەو بە هەژاری بممرێنەو لەگەڵ کۆمای هەژاران زندوم کەوەو کۆم کەرەوە.

فیزو لوتبەرزی بەحەرام داناوەو نای لێکردوە. لەخانەوادەی دەگەیەنێ کە سیفەتێکی دزێو و قێزەونەو دەفەرموێ:
يحشر المتكبرون يوم القيامة في صورة الذر، يغشاهم الذل من كل مكان [٢]
لە ڕۆژی قیامەت ئەوانەی لوتیان بەرز هەڵناوەو خۆیان لە خەڵکی بە گەورەتر داناوە، وەکو مێرولان بەبچوکی زندو دەکرێنەوەو لە هەمو لایەکەوە سەرشۆڕی لەخۆیان وەردەپێچێ.

هەروەها لە خواوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:
الكبرياء ردائي، والعظمة إزاري، فمن نازعني واحدا منها قذفته في النار [٣]
گەورەیی و مەزنێتی شایەن بەمنن، هەرکێ لە هەر کامیان کێشەو بەربەرەکانێم لەگەڵدا بکا، لە ئاگری هەڵداوێم.
پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) خۆشەویست و لەبەر دلان بو، کەنیزە قۆڵی گرتوە، لەگەڵی ڕۆییوەو داخوازیەکانی هێناوەتەدی، سەردانی (ئوم ئەیمەنی) کردوە کە بەندەیەك بوە. کە شاندەکەی (عامری کوڕی صەعصەعە) پێیاندا هەڵگوتوەو گوتویانە: تۆ باشترین و چاکترین و گەورەی کوڕی گەورەمانی، پێیانی فەرموە:

---

(١) أخرجه الترمذي ٢٣٥٢ عن أنس رضي الله عنه، وابن ماجه ٤١٢٦ والحاكم ٧٩١١ عن أبي سعيد الخدري وصححه .
(٢) أخرجه أحمد ٦٦٣٩، والترمذي ٢٤٩٢، انظر كشف الخفاء ٣٢٣٦.
(٣) أخرجه مسلم ٢٦٢٠ وأبو داود ٤٠٩٠ واللفظ له.

يا أيها الناس! قولوا بقولكم أو ببعض قولكم، لا يستجرينّكم الشيطان[١]
خەڵکینە بەقسەی ئاسایی خۆتان لەگەڵم بدوێن و شەیتان تەفرەتان نەدا.

کاتێکیش کابرایەك پێیگوت: ئەگەر خوا بیەوێ و ئەتۆش بتەوێ، توڕەبو و فەرموی:
ويحك! أجعلتني واللهَ عدلاً؟ بل ما شاء الله وحده [٢]
هەی بەدبەخت! من و خوا دەکەیە هاوتای یەکتری؟ بەڵکو بڵێ: تەنها خوا بیەوێ.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) خۆی پێویستیەکانی خاوخێزانی جێبەجێ دەکرد، کەوشەکانی[٣] خۆی جوت دەکرد، جلەکانی پینە دەکرد، گێسکی لە ماڵێ دەدا، مەڕی دەدۆشی، لەگەڵ خێزانەکانی گۆشتی ورد دەکرد[٤]، خواردنی بۆ میوانان دادەنا، لەگەڵ ئەوانەی سەردانیان دەکرد ڕوخۆشی دەنواندو مەجلیسی گەرم دەکردو لە هەواڵی دەپرسین، لەرێگادا بەنۆرە لەگەڵ هاوڕێکانی سواری وشتر دەبون، جلی خوری لەبەر دەکردو نانی جۆی دەخوارد، گەلا جاران بەپێخواسی دەکەوتە رێ، لە مزگەوتێ دەنوست، سواری کەرێ دەبو، لە پشتەوەی سواری سوار دەبو، یارمەتی بێتاقەتانی دەداو کاروانی بەسەر دەکردەوە، لە دواوەی هەموویانەوە دەبو و یارمەتی پێویستانی دەدا، دەبوە هاوڕێی ئەوانەی بەتەنیا بون.
ئەو پێغەمبەرە ئاوا گەورەو بەڕێز بوە، بۆیە نێوبانگی لەسەر زاران گێڕدراوەتەوەو سواران دەنگوباسیان لە شارو دێیان بلاوکردۆتەوەو ئادەمی و جنۆکە هەواڵیان ڕاگەیاندوە.

---

(١) أخرجه أحمد ١٥٨٧٦ وأبو داود ٤٨٠٦.
(٢) أخرجه أحمد (١٨٤٢، ٢٥٥٧) والنسائي في السنن الكبرى ١٠٨٢٥ عن ابن عباس رضي الله عنهما.
(٣) کەوش: پێڵاو.
(٤) خەڵکانێك پێیانوایە کە ئەگەر پیاو یارمەتی خێزانی بدات و گۆشت ورد بکات و گێسك لە ماڵی بدات، کارێکی نەشیاوە، کەچی پێغەمبەری سەروەرو سەربەرزو جوامێر ئەو کارانەی کردوە، بە ئەرکی خۆشی زانیوە کە ماف بداتە ئافرەتان و یارمەتیان بدات.
**(ئەوا محمد سعید)**

# نەرم و نیانی محمد (صلی الله علیه و سلم)

ئەو پێغەمبەری خوا بو بۆیە لەهەمو خەڵكی نەرمترو سینە فرەوانترو قسە شیرنتر بو، ڕەوشت و خوی جوان و لەجێ و ئێسك سوكتر بو.
تورەیی خۆی قوت دەدایەوەو لەهەڵەكارانی دەبوری و چاوی لێدەپۆشین. لە مافە تایبەتەكانی خۆی خۆش دەبو ئەگەر مافی خوای بەسەرەوە نەبوایە، لەوانە خۆش بو كە زوڵمیان لێكردو لەزێدەكەی دەریانكردو ئازاریان داو جوێنیان پێداو قسەی سوك و پوكیان پێگوت و دژایەتیان كرد. لە فەتحی مەككەدا فەرموی:
اذهبوا فأنتم الطلقاء [1]
بڕۆن ئێوە ئازادن.

لە سوفیانی كوڕی حاریسی ئامۆزاشی خۆش بو، كە هاتە بەردەمی پێغەمبەرو وتی: سوێند بەخوا! خوا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژاردو ئێمە هەڵەبارو تاوانبار بوین. ئەویش (صلی الله علیه و سلم) فەرموی:
﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾
ئەمرۆ گلەو گازاندە لەسەر هیچكەسێكتان نەماوە، خوا خەتاتان دەپۆشێ و هەر خۆی لە میهرەبانان میهرەبانترە[2].

---

(١) أخرجه الشافعي في الأم ٣٦١\٧، والطبري في تاريخه ١٦١\٢ والبيهقي في السنن الكبرى ١٨٠٥٥ انظر صحيح الجامع ٤٨١٥ .
(٢) (يوسف - ٩٢).

بیابانی و چۆلی نشینان، بە هەڵسوکەوتی زۆروشك ناشرینەوە ڕوبەروی دەبونەوە، بەڵام ئەو نەرمی دەنواندو چاوی لێدەپۆشین، فەرمانەکەی خوای لەخۆی دەهێنایەدی کە دەفەرموێ:

﴿فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾[1]

بە شێوازێکی جوان چاوپۆشی بکەو ببورە.

وەڵامی خراپەی بەخراپە نەدەدایەوە، بەڵکو لێیخۆش دەبو و چاوی لێدەپۆشی. لەپێناو خۆی تورە نەدەبو، لەپێناو خۆی تۆڵەی وەرنەدەگرتەوە. بەڵکو ئەو کاتەی تورە دەبو پتر نەرمی دەنواندو تەنانەت لەروی ئەو کەسەی تورەشی کردوە بزەی لەسەر لێوانیدا گەڕاوە. ئامۆژگاری یەکێك لەهاوەلانی کردوەو فەرمویەتی:

لا تغضب، لا تغضب، لا تغضب[2]

تورە مەبە، تورە مەبە، تورە مەبە.

قسەی خراپیان دەرهەق کردوەو بۆیان گێراوەتەوە، کەچی لێی نەپێچاوەتەوە کێ گوتویەتی و ئەگەر زانیویەتیشی سەرکۆنەی نەکردوەو سزای نەداوە. فەرمویەتی:

لا يبلغني أحد منكم ما قيل فـيّ، فإني أحب أن أخرج إليك وأنا سليم الصدر[3]

کەس قسەم بۆ نەهێنێتەوە کە کێ چی لەبارەی من گوتوە، چونکە حەز دەکەم کە دێمە لاتان سینەم بێگەرد و بێ کینە بێ.

جارێکیان ئیبنی مەسعود رەزای خوای لێبێ قسەیەکی بۆ دەگەرێنێتەوە، ئەویش (صلى الله عليه و سلم) ڕەنگی ڕوخساری دەگۆڕێ و دەفەرموێ:

رحم الله موسى، أوذي بأكثر من هذا فصبر[4]

خوا رەحم بەموسا بکا، پتر لەوەش ئازاریان دا کەچی ئارامی گرت.

---

(١) (الحجر - ٨٥).

(٢) أخرجه البخاري ٦١١٦.

(٣) أخرجه احمد ٣٧٥٠ وأبو داود ٤٨٦٠ والترمذي ٣٨٩٦ عن عبدالله بن مسعود.

(٤) أخرجه البخاري (٣١٥٠، ٣٤٠٥) ومسلم ١٠٦٢.

ناحەزو دوژمنان دەرهەق بە پەیام و ناموس و نێوبانگ و خاوخێزانی گەلا ئەزیەتیان پێگەیاند، بەڵام ئەوکاتەی دەسەلاتی بەسەریاندا شکا لێی بورین و بە نەرمی لەگەڵیان جولایەوەو فەرموی:

من كفّ غضبه كفّ الله عنه عذابه [1]

ئەوەی لەپێناوی خوا تورەیی قوت داتەوە، ئەوا خوا لەسزای خۆی دەیپارێزێ.

جارێکیان پیاوێك پێیگوت: بەدادگەری بجولێوە! ئەویش (صلى الله عليه و سلم) فەرموی:

خبت وخسرت إذا لم أعدل [2]

رەنجەڕۆ و دۆڕاوم ئەگەر دادگەر نەبم.

ئەزیەتیشی نەداو لێشی خۆش بو.

جارێکی تر جولەکەکان هەندێ کاری نابەدڵ و نابەجێیان کردو دڵیان ئێشاند، بەڵام ئەو (صلى الله عليه و سلم) چاوی لا پۆشین و لێیان خۆش بو.

لێبوردەیی و خورەوشتە بەرزو جوانەکانی، هەمو خەڵکی دەگرتەوەو هیچ کەسێکی هەڵنەدەبوارد. ئاگری ڕق و کینەی ناو دلانی بەسای وتە جوان و هەڵوێستە نەرم و نیانەکانی دەکوژاندەوە. ئەو فەرمانەی خوای لەخۆی هێنابوە دی کە دەفەرموێ:

﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَۚ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ [3]

بە چاکترین هەڵوێست بەرپەرچی خراپە بدەوە، ئێمە بە وەسفکاریەکانی ئەوان زاناترین.

لەگەڵ خێزانەکانی لە هەمو خەڵکی نەرمونیانتر بو، سوحبەت و گاڵتەی لەگەڵ دەکردن و بەقسەی خۆش خۆش لەگەڵیان دەدواو لەهەڵەکانیانی دەبوری و بەروێکی گەش و بەبزەوە دەچوە لایان و شادی و کامەرانی دەخستە ناویان.

---

(١) أخرجه أبو يعلى ٤٣٣٨ والبيهقي في الشعب ٨٣١١ وانظر العلل لابن أبي حاتم ١٩١٩ ومجمع الزاوئد ١٠\٢٩٨.

(٢) أخرجه البخاري ٣١٣٨ ومسلم ١٠٦٣ واللفظ له عن جابر بن عبدالله.

(٣) (المؤمنون - ٩٦).

ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێبێ دەڵێ: من ماوەی (دە) سالان لە ماڵی پێغەمبەردا خزمەتم کرد، لەهیچ شتێ ئەگەر کردبم نەیگوتوە بۆ کردوتە، ئەگەر نەشمکردبێ نەیگوتوە بۆ نەتکردوە. بێگومان ئەم ڕەفتارە ئەوپەڕی نەرم و نیانی و ڕەوشتجوانی دەسەلمێنێ و لوتکەی هەڵویستی جوان و نێوان سازی و تەبایی نیشان دەدات. جا نەك هەر خزمەتکارەکەی بگرە هاوپەیمان و هاوڕێ و هاوەڵانیشی لە ڕەفتارە نەرم و نیان و پڕ لە خۆشەویستی و جوانەکانی ئەودا غەرقی شادمانی ببون.

ڕەفتارەکانی ئەوەندە شیرن و لەبەر دلان بو، تاوەك خۆشەویسترین کەس چوە ناو دلان و روحەکان هۆگرو شەیدای بون و دەرونەکان بۆ دیداری گریان تێبەربو.

# بەزەیی محمد (صلى الله عليه و سلم)

خوا بەم فەرمودەیە وەسفی کردوە:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴾

تۆمان بۆ ئەوە ناردوە تا ببیتە میهرەبانی بۆ جیهانییان[1].

ئەو (صلى الله عليه و سلم) بۆ تەواوی مرۆڤایەتی رەحمەت بو، لێیان گێڕاوەتەوە کە فەرمویەتی:

إنما أنا رحمة مهداة[2]

من رەحمەتێکی خەلاتکراوم.

جارێکیان بۆ کچەزایەکی گریا کە لەئاوزینگانی سەرەمەرگ دابو. لەبارەی گریانەکەوە لێیان پرسی، ئەویش فەرموی:

هذه رحمة يضعها الله في قلب من يشاء من عباده، وإنما يرحم الله من عباده الرحماء [3]

ئەمە رەحمێکە خوا بەویستی خۆی دەیخاتە دڵی بەندەکانیەوە، خواش رەحم بەبەندە بەرەحمەکانی دەکات.

بۆ دورو نزیکان ڕەحمەت بو، دڵی نەدەهات خەڵك بخاتە بەر زەحمەت و بارقورسی، رەچاوی باری خەڵکی دەکردو باری سوك دەکردن. جار هەبوە ویستویەتی

---

(١) (الأنبياء - ١٠٧).

(٢) أخرجه الدارمي ١٥ مرسلا، والحاكم موصولا عن أبي هريرة برقم ١٠٠ وصححه.

(٣) أخرجه البخاري (١٢٨٤، ٦٦٥٥) ومسلم ٩٢٣ عن أسامة بن زيد رضي الله عنه.

نوێژەکەی درێژ بکاتەوە، بەڵام دەنگی گریانی ساوای بیستوەو نوێژەکەی کورت کردۆتەوە تا دایکەکەی ئەزیەت نەخوا. جارێك لەناو نوێژێ بو، ئومامەی کچی زەینەبی کیژی گریا، هەڵیگرت و گرتیە باوەشی، کە بۆ سوژدە دەچوە دایدەناو کە هەڵدەستایەوە هەڵیدەگرتەوە.

جارێکیان لەسوژدەدا حەسەن دەچێتە سەر پشتی، ئەویش سوژدەکەی درێژ دەکاتەوە، کە سڵاوی دایەوە تەوازۆی لەخەڵکی خواست و فەرموی:

إن إبني هذا ارتحلني، فكرهت أن أرفع رأسي حتى ينزل

حەسەنی کوڕم خۆی بەسەر پشتم دادا، منیش حەزم نەکرد سەر بەرز کەمەوە تا هاتە خوارێ[1].

هەروەها فەرمویەتی:

من أمّ منكم الناس فليخفف، فإن فيهم الكبير والصغير والمريض وذا الحاجة[2]

ئەو کەسی پێشنوێژی کرد با نوێژێکی کورت و سوکەلەبکات، چونکە هی وایان تێدایە پیرە یا منداڵە یا نەخۆشە یا کارێکی پێویستی هەیە.

جارێکیان موعازی کوڕی جەبەل نوێژی بەخەڵك درێژ کردەوە، ئەویش پێی فەرمو:

أفتّان أنت يا معاذ [3] ؟

ئەی موعاز ئەتۆ بەهیلاك بەری؟

هەروەها فەرمویەتی:

لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة:

ئەگەر زەحمەتم نەخستبایە سەر ئوممەتەکەم، ئەوا فەرمانم پێدەکردن لەسەرەتای هەمو نوێژێکدا سیواکیان بەکار بهێنایایە.

گەلێجار وازی لە هەندێ کاران هێناوە، نەبادا لەسەر ئوممەتەکەی فەرز بێ، جا بۆیەوەك ئامۆژگاریەك بەیاوەرانی دەگوت کە کارەکە بکەن.

---

(١) أخرجه أحمد ٢٧١٠٠ والنسائي ١١٤١ عن شداد بن الهاد رضي الله عنه.

(٢) أخرجه البخاري ٧٠٣ ومسلم ٤٦٧ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

(٣) أخرجه البخاري (٧٠٥، ٦١٠٦) ومسلم ٤٦٥ عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه.

ئەمانە بەشێك بون لەمیهرەبانی پێغەمبەر سڵاوی خوای لەسەر بێ. هەروەها دەیفەرمو:

والقصد القصد تبلغوا [١]

کورتی و پوختی، کورتی و پوختی، بەکورتی و پوختی دەگەنە مەرامی دینداریتان.

بُعثت بالحنيفية السمحة

من بەئاینێکی نەرم و نیان و لێبوردەوە نێردراوم [٢].

خير دينكم أيسره [٣]

باشترین دینداری، بە ساناترین باری.

عليكم هدياً قاصداً [٤]

رێی رۆشن و کورت و پوخت بگرن.

خذوا من العمل ما تطيقون، فإنّ الله لا يملّ حتى تملّوا [٥]

ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە عیبادەت بکەن، چونکە تا ئیوە بێزار نەبن خوا بێزار نابێ.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لەنێوانی هەر دو کارێکدا ئەگەر سەرپشك کرابێ، ئاسانەکەی هەڵبژاردوە، بەو مەرجەی هەڵبژێردراوەکە گوناح نەبوبێ، هەروەها نارەزایی لەو سێ کەسە دەربڕی کە زۆر بە توندی عیبادەتیان وەرگرتبو و فەرموی:

والله إنّي لأخشاكم لله وأتقاكم له، ولكنّني أقوم وأنام، وأصوم وأفطر، فمن رغب عن سنّتي فليس منّي [٦]

سوێند بەخوا با پێتان بڵێم، من لە هەموتان پتر لەخوا دەترسم و لە هەموشتان خۆپارێزترم، کەچی شەونوێژیش دەکەم و دەشخەوم، بەرۆژو دەبم و دەشخۆم، جا هەر کەسێ خۆی لە دەستوری من هەڵبوێرێ لەمن نیە.

---

(١) أخرجه البخاري ٦٤٦٣ عن أبي هريرة رضي الله عنه

(٢) أخرجه أحمد ٢١٧٨٨ عن أبي أمامة رضي الله عنه

(٣) أخرجه أحمد ١٥٥٠٦ وانظر مجمع الزوائد ٣٠٨١٣

(٤) أخرجه أحمد (٢٢٤٥٤، ٢٢٥٤٤) والبيهقي في السنن الكبرى ٤٥١٩ عن بريدة الأسلمي، وانظر البيان والتعريف ١٠٩١٢.

(٥) أخرجه البخاري ٥٨٦٢ ومسلم ٧٨٢ عن عائشة رضي الله عنها.

(٦) أخرجه البخاري ٥٠٦٣ ومسلم ١٤٠١ عن أنس بن مالك رضي الله عنه.

لە سەفەردا ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی شکاندوە، نوێژی چوارینەی کورت کردۆتەوە، (نیوەڕۆ و عەسر) و ( مەغریب و عیشا)ی کۆکردۆتەوە، لەکاتی بارینی باراندا بانگی ڕاهێشتوە کە هەرکەس با لە بنەوبارگەکەی خۆی نوێژەکەی بکات و نەیەنە جەماعەتێ. هەروەها فەرمویەتی:

هلك المتنطعون [1]

ئەوانەی زۆر بەتوندی دینیان گرتوە، فەوتاون.

ما كان الرفق في شيء إلاّ زانه، وما نزع من شيء إلاّ شانه [2]

نەرمونیانی لەهەر شتێکدا بێ جوانی دەکا، لەهەر شتێکیش داماڵرێ ناشرینی دەکا.

ناڕەزایی لە عەمری کوڕی عاص دەربڕی لەوەی کە خۆی بە عیبادەت زۆر ماندو دەکردو فەرموی:

إيّاكم والغلو [3]

نەکەن زیادڕەوی بکەن.

أمّتي أمّة مرحومة [4]

ئوممەتی من ئوممەتێکی ڕەحم پێکراوە.

إذا أمرتكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم [5]

هەر فەرمانێکم پێکردن بەپێی توانا جێبەجێی کەن.

ئەم ئاسانیەی ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەگەڵ ئاسانی سوننەت و شەریعەتەکەیدا هەماهەنگە، پەیڕەوکردنێکیش بوە لەو فەرمودانەی

---

(١) أخرجه البخاري ٥٠٦٣ ومسلم ١٤٠١ عن أنس بن مالك رضي الله عنه.

(٢) أخرجه مسلم ٢٥٩٤ عن عائشة رضي الله عنها.

(٣) أخرجه مسلم ٢٦٧٠ عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه.

(٤) أخرجه أحمد (١٩١٧٩، ١٩٢٥٣)، وأبو داود ٤٢٧٦ والحاكم ٨٣٧٢ عن أبي موسى رضي الله عنه وصححه.

(٥) أخرجه البخاري ٧٢٨٨ ومسلم ١٣٣٧ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

پەروەردگاری کە فەرمویەتی:

﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴾[١]

رێت بۆ خۆش دەکەین تا بەسانایی بگەی.

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾[٢]

خوا ئەرکی لەتوانا بەدەر بەسەر کەسدا ناسەپێنێ.

﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾[٣]

تا پێتان دەکرێ لەخوا بترسن.

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾[٤]

خوا ئاسانی ئێوەی دەوێ و بارقورسی ئێوەی ناوێ.

﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾[٥]

لە دیندا زەحمەتی بۆ دانەناون.

گەلێ ئایەتی دیکەش..

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لە پەیام و بانگەوازو خواپەرستی و نوێژ و ڕۆژی و خواردن و خواردنەوەو بەرگ و پۆشاك و هەروەها لە ماڵێ و لە سەفەرو لەئاکاریدا، هەمیشە ئاسانکارو ساناگرو میهرەبان بو. بگرە تەواوی ژیانەکەی لەسەر ئاسانکاری بنیات نابو، چونکە ئەو بۆ ئەوە نێردراوە تا کۆت و بەندو باری گران لەسەر ئوممەتەکەی هەڵگرێ.

لەڕاستیدا ئاسانکاری هەر لەگەڵ وی هاتە ئاراوە، ساناگری هەر لە شەریعەتی وی سەری هەڵداوە. تەنانەت ئەو خۆی بریتی بو لە ئاسانی و نەرمونیانی و میهرەبانی.

---

(١) (الأعلى - ٨). (٢) (البقرة - ٢٨٦). (٣) (التغابن - ١٦).
(٤) (البقرة - ١٨٥). (٥) (الحج - ٧٨).

# زیکرەکانی محمد (صلی الله علیه و سلم)

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) له هەمو کەس پتر یادی پەروەردگاری دەکردەوە، هەمو ژیانی هەر یادکردنەوەی خوا بو، بانگەوازو ئامۆژگاری و پەرستن و فەتواکانی بگرە شەو و ڕۆژ و سەفەرو نیشتەجێبون و ڕێورەسم و بۆنەکانی ژیانی تەنانەت هەناسەکانیشی بریتی بون لەیادکردنەوەی خوا. دڵی بەیادی خواوە بەند بو، بەچاو دەنوست بەڵام بەدڵ بەئاگا بو، خەڵك كه تەماشایان دەکرد یادی خوایان دەکەوتەوە دڵ .

هانی خەڵکی دەدا تا یادی خوا بکەن و له خوا غافڵ نەبن و دەیفەرمو:

سبق المفردون: الذاكرون الله كثيرا والذاكرات [(١)]

تاکپەرستان وەپێش کەوتن، ئەو ژن و پیاوانەی کە زۆر یادی خوا دەکەنەوە

مثل الذي يذكر ربه والّذي لا يذكره كمثل الحيِّ والميِّت [(٢)]

نمونەی ئەو کەسەی یادی خوا دەکاتەوەو ئەوەی نایکاتەوە وەکو زندو و مردو وایە

لا يزال لسانك رطبا من ذكر الله [(٣)]

هەمیشە زمانت بەیادی خوا تەڕ بێ.

هەروەها ڕایگەیاندوە کە ئەو کەس باشترین کەسە کە پتر له هەمو کەسێ یادی خوا بکاتەوە.

---

(١) أخرجه مسلم ٢٦٧٦ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

(٢) أخرجه البخاري ٦٤٠٧ ومسلم ٧٧٩ عن أبي موسى رضي الله عنه.

(٣) أخرجه أحمد (١٧٢٢٧، ١٧٢٤٥) والترمذي ٣٣٧٥ وابن ماجه ٣٧٩٣ انظر المشكاة ٢٢٧٩ .

له فەرمودەیەکی قودسیشدا فەرمویەتی:

أنا مع عبدي ما ذكرني وتحركت شفتاه [١]

تا بەندەکەم یادم بکاتەوەو لێوی بەیادی منەوە بجولا، من لەگەڵیمە.

من ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، ومن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منهم [٢]

ئەو کەسی لەدڵی خۆی یادم بکاتەوە من یادی دەکەمەوە، ئەو کەسیش لەناو کۆمەڵێك یادم بکاتەوە ئەوا لەنێو کۆمەڵێکی چاکتر یادی دەکەمەوە.

هەروەها بەدەیان فەرمودەی دروستی هەیە کە هانی موسڵمانان دەدەن یادی خوا بکەن و زیکری:

لا اله الا الله و الحمد لله و الله اكبر و لاحول ولا قوه الا بالله و استغفر الله بکەن و سەڵاواتان لا بدەن.

هەمیشە بەبیر خەڵکی دێنایەوە کە یادی خوا چ جۆرە ڕێزانەو پاداشتێکی هەیە. ژمارەو بۆنەی یادەکانی باسکردوەو زیکری ڕۆژانەی دیار کردوە. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) یادکارو سوپاسکارو ئارامگر بو، خوای وەبیر نەتەوەکەی دێنایەوەو فێری دەکردن کە چۆن خوا بەگەورە بگرن و تەسبیحاتی بکەن و تێیگەیاندن کە سودو کەڵکی یادەکان بەچ ئەندازەیەکن. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بەختەوەرترین کەس بو بەیادکردنەوەی خوا، بەسای ئەم نیعمەتەوە سازترین و لەبارترین باری بۆ ڕەخساو خۆشترین ژیانی بەسەر دەبرد، لە یادەکاندا گەلا وێردی هەبو کە پڕ بەدڵ و بەوپەڕی ترس و خۆشەویستی و دڵکزی و گەردەنکەچی و سام و تەماو هومێدەوە دیوتنەوە.

---

(١) أخرجه البخاري معلقا في كتاب التوحيد، باب قول الله ((لاتحرك به لسانك))، وأحمد (١٠٥٨٥، ١٠٥٩٢) و ابن ماجه ٣٧٩٢ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

(٢) أخرجه البخاري ٧٤٠٥ ومسلم ٢٦٧٥ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

# نـزاكانی محمد (صلی الله علیه و سلم)

خوا دەفەرموێ:

﴿ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾ (١)

لەبەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بەدەنگتانەوە دێم.

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ ﴾ (٢)

ئەگەر بەندەکانم لەبارەی منەوە لێیان پرسی، من نزیکم، هەرکەس هانام وەبەربێنێ، بێوەڵامی ناهێڵمەوە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) فەرمویەتی:

الدعاء هو العبادة (٣)

پاڕانەوە پەرستنە.

من لم يسأل الله يغضب عليه (٤)

ئەو کەسی لەخوا نەپاڕێتەوە خوا لێی توڕە دەبێت.

---

(١) (غافر - ٦٠).

(٢) (البقرة - ١٨٦).

(٣) أخرجه أحمد (١٧٨٨٨، ١٧٩١٩) وأبو داود ١٤٧٩ والترمذي ( ٢٩٦٩، ٣٢٤٧) عن النعمان بن بشير وصححه.

(٤) أخرجه البخاري في الأدب المفرد ٦٥٨ والترمذي ٣٣٧٣ عن أبي هريرة رضي الله عنه وصححه.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە هەمو حاڵەتەکانیدا هەر لەخوا دەپاڕایەوە، کاروبارەکانی بە خوا ڕاسپاردبو، زۆر لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە کەوەبەر ڕەحمەت و لێبوردەیی بکەوێت و چاکەی لەگەڵدا بکات و ڕێزانەی پێ ببەخشێ. ئەو دوعایانەی دەکرد کە پڕمانان و تەواوی داخوازیەکان دەپێکن، وەك ئەوەی کە فەرمویەتی:

اللّهم آتنا في الدنيا حسنةً وفي الآخرةِ حسنةً وقنا عذاب النّار [١]

خوایە لەدنیاو دواییدا شتی چاکمان پێ ببەخشەو لە ئازاری ئاگر رزگارمان بکە.

اللّهم إنّي أسألكَ العفوَ والعافِية [٢]

خوایە من داوای لێبوردن و سەلامەتیت لێدەکەم.

دوعاکانی سێ جاران دەگوتەوەو لە سەرەتادا سوپاس و ستایشی خوای دەکردو لە کاتی داواکردندا روی لە قیبلە دەکردو جار هەبو دەستنوێژیشی هەڵدەگرت. نەتەوەکەی وا فێری ئادابی دوعا دەکرد کە لە سەرەتادا ستایشی خوا بکەن و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر لێبدەن، بە ناوە جوانەکانی خوا لە خوا بپاڕێنەوە، بە ڕشتی[٣] داواکانیان بکەن، زۆری دوبارە بکەنەوە، ئەو کاتانە هەڵبژێرن کە دوعایان تێدا قبوڵ دەبێ بۆ نمونە: دوای تەواوبونی نوێژەکان، بەینی بانگ و قامەتان، ئاخیروەختی هەینیان، ڕۆژی عەرەفات، کاتی سوژدە بردن و بەرۆژو بون و سەفەرکردن و هەروەها دوعای باوك بۆ کوڕیش تایبەتمەندی خۆی هەیە. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە قەیران و تەنگاناندا زۆر زۆر دەپاڕایەوەو بەوپەڕی ملکەچی و ترس و مەحەببەت و گومان باشی و بەلالانەوەیەکی تەواوەوە داخوازیەکانی دوبارەو سێبارە دەکردەوە، وەك دوعاکانی شەڕی بەدرو شەڕی خەندەق و ڕۆژی عەرەفە.

---

(١) أخرجه البخاري (٤٥٢٢، ٦٣٨٩) ومسلم ٢٦٨٨ عن انس رضي الله عنه.

(٢) أخرجه أحمد ٤٧٧٠ وأبو داود ٥٠٧٤ وابن ماجه ٣٨٧١ والحاكم ١٩٠٢ عن ابن عمر رضي الله عنهما وصححه.

(٣) ڕشت: مکوڕی.

خوا دوعاکانی قبوڵ دەکردو داخوازیەکانی بۆ دێنایە دی، وەك ئەو رۆژەی کە لەسەر مینبەردا پاڕایەوە باران بباریێ و دەسبەجێ باری، یا ئەو رۆژەی پەنجەی راداشت تا مانگ شەق بێ، ئەویش شەق بو بەبڕیاری پەروەردگاری. هەروەها خوا بەرەکەتی دەخستە نان و ئاوی و لە شەڕەکان سەری دەخست، دینەکەی بەرز راگرت و کۆمەڵەکەی بەهێز کردو دوژمنانی سەرشۆڕ کردو ناحەزانی دەمکوت کرد، هەمیشە یارمەتی دەدا تا ئەو ڕۆژەی تەواوی داخوازیەکانی بۆ هاتەدی و ڕێزو پایەی بەرز بوەوەو سەرەنجامی دوایی بەلای ویدا شکایەوە.

# ئاواتەکانی محمد (صلی الله علیه و سلم)

هیممەت لەگەڵیدا لەدایك بو، لە منداڵیرا دەرون بەرزو قایم بو، چاوی لە ڕەوشتە پەسندەکان هەڵبڕیبو و شتی کەم و بێنرخی لەخۆ نەدەوەشاندەوەو مەیلی لە کاری چروك نەبو، خاوەن ئاواتی بەرزو دەسپێشخەرو پێشەنگ و شۆڕەسواری تاقانەی مەیدانان بو. ڕێژینناسان[1] دەگێڕنەوە کە عەبدولموتەللیبی باپیری لەبەردەم کەعبەدا جێگەیەکی تایبەت بەخۆی هەبو و لەبەر پلەو پایەو ڕێزەکەی نەدەبوایە کەسی لەسەر دانیشێ، جارێکیان پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) کە هێشتا منداڵ بو چوە ئەوێ و لەو جیگایە بترازێ بەهیچ شوێنی تر رازی نەبو، هەرچەندە خزمەتکاران لەگەڵیشی کەوتنە کێشە.

بەر لە پێغەمبەرایەتیش نیشانەو ئاکاری سەرکردەیی و سەروەری و ڕێبەرایەتی تێدا هەبو، تەنانەت قورەیشیەکان بەناوی راستگۆی دەسپاك ناویان هەڵدەناو بەدادوەریەکەی ڕازی بون و کارەکانیان بۆ بەردەستی وی دەگەڕاندەوە.

جا کە خوا پەیامی پێ بەخشی، (وەسیلە)ی کردە ئاواتی کە بەرزترین پلەو پایەی ناو بەهەشتە، لەخوا پاڕایەوە پێی ببەخشێ و ئێمەشی فێرکرد بۆی بپارێینەوە، هەروەها گەیشتۆتە سیدرەی مونتەهاو کەمالی رەهای بەشەرێتی و چاکندەیی مرۆڤایەتیشی وەدەستهێناوە.

یەکێك لە نیشانەکانی دەرونبەرزێتی ئەوە بو کە دنیای نەخواست و داخوازیە کەم نرخەکانی دنیای ڕەتکردەوەو کۆشك و تەلارو پاشایەتی نەویست.

---

(١) ڕێژین: رابردوی ژیان.



## ئەی پێغەمبەر خودات بەسە

خوات هەبێ بەسەو خەفەت هەڵمەگرە لە ژیان، ئەو دەتپارێزێ لەبەلای زەمان، لە پێشهات و مەرگەساتان، لە ناخۆشی و کارەساتان، خوایە پشت و کۆمەکی تۆ، دەی کەواتە ترست نەبێ، باکت نەبێ، با نەمێنێ نیگەرانی و دڵەڕاوکێ و دڵتەنگی تۆ.

خوات هەبێ بەسە، سەرت دەخا بەسەر دوژمن، با وێڵ بێ ناحەزی رقن، خوایە پەناو پاڵپشتی تۆ، با ئارام هەستی تۆ، روی تێبکەی پێتدەبەخشێ، تکای لێبکەی دەتبەخشێ، سوپاسی کەی پترت بەسەر هەڵدەڕێژێ، زیکری بکەی ناوت بە بڵندی هەڵدەنێ، لەشەڕێ سەرت دەخا، لە دادوەری بە رێنوێنی رێکت دەخاو هەقیقەتت بۆ دەردەخا.

خوات هەبێ بەسە، بێخزم و هۆزیش هەر بالادەستی، بێپاسەوانیش هەر دورەدەستی، مادەم خودا پشتی گرتی، دوژمن هەمیشە ڕوی لە پەستی. مادەم خودا دەستی گرتی، هەمیشە ڕشت و بەبڕستی، دەی کەوایە لەچاوی چاوپیسان و لە فێڵی فێڵبازان و لە ناپاکی بێبڕوایان و لە تەڵەو تەڵەکەی بەدکاران باکت نەبێ.

لەمەڕ زایەڵەی[1] نارەوایی و بانگەوازی ناخودایی، لە هەڵمەتی دوژمنان و لە هەڕەشەی جولەکان، لە چاوەگێڕی دوڕوان و هاشەهاشی حەسودان، خۆت ڕاگرە، چونکە تۆ خوات هەیەو بەسە.

ئەگەر زەمانە گۆڕا، خزم و دۆست پشتیان تێکردی، دوژمن لێت قیت بونەوە،

(١) زایەڵە: هاوار.

مسولّمانان ورەیان بەرداو سەرکەوتن وا زو نەهات، خۆت راگرە، چونکە تۆ خوات هەیەو بەسە.

ئەگەر بەلا ڕوی تێکردی، کۆستت کەوت و بەلا لە دەورت گەڕا، لە هیچ مرۆیێ مەپاڕێوەو لە خوا بترازێ ڕو لە کەس مەکە، چونکە تۆ خوات هەیەو بەسە.

ئەگەر نەخۆشی شەنگی لێبڕی، قەرزاری باری گران کردی، هەژاری روی تێکردی، یا خواستێکت بۆ جێبەجێ نەدەبو، خەمگین مەبە چونکە تۆ خوات هەیەو بەسە.

ئەگەر سەرکەوتن وەدرەنگ کەوت و دنیا بو بەنەهات، تاوی خۆشی درەنگ هەلات، سەختبون بەلاو پێشهات، خەمگین مەبە چونکە خوات هەیەو بەسە.

تۆ هەر بەرزە ڕێزو بەهات، هەر خوایە هێزو هەنات، هەر پەرژین و پارێزراوی، چونکە ئازیزو خۆشەویستی خواو پێغەمبەری بژێردراوی.

## لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا :

## خەمگین مەبە خوا لەگەڵمانە

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەناو ئەشکەوتیَ، کە لەگەڵ ئەبوبەکری یاوەری خۆشەویستی، خۆیان حەشار دابو و دوژمنان دورەیان دابون، ئەم وشە جوان و مەردانەیەی فەرمو "خەمگین مەبە خوا لەگەڵمانە"، بەورەیەکی بەرزو بەدڵێکی چەسپیو و بەبڕیارێکی چوست و بەهەستێکی ئارام، ئەم وشە جوانانەی فەرمو "خەمگین مەبە خوا لەگەڵمانە"، جا کە خوامان لەگەڵدا بیَ، بۆچی خەمناك و نائارام بین و لەچی بترسین!

دڵنیابە نادۆڕێین و ژێر ناکەوین، گومڕا نابین و نافەوتێین، بێهومێدو هیوابڕ نابین، چونکە خوامان لەگەڵدایە.

سەرکەوتن یاوەرمانە، دەربازبون هاوڕێمانە، رزگاربون هەڤاڵمانە، بردنەوە مەبەستمانە، سەرەنجامیش سەرفرازی و گەردنکەشی، چونکە خوامان لەگەڵدایە.

چما کەس هەیە دڵی لە دڵی ئێمە سەقامگیرتر بیَ؟ کەس هەیە بەرنامەکەی لە بەرنامەی ئێمە تۆکمەتر بیَ؟ کەس هەیە ڕێبیرەکەی[1] لە ڕێبیری ئێمە پایەدارتر بیَ؟ کەس هەیە ڕێژینەکەی لە رێژینی ئێمە خاوێنتر بیَ؟ کەس هەیە لەپایەی لەپایەی ئێمە بەرزتر بیَ؟ . نیە، چونکە خوامان لەگەڵدایە.

سەیرکە ئەوانەی دوژمنن، چەندە بێهێزو بێپێزن، ئەوانەی ڕقابەرن چەندە زەبون و بێڕێزن، ئەوانەی سەنگەریان لێگرتوین چەند بچوك و بودەڵەن، ئەوانەی دژمان وەستاون چەند بیَ ورەو پوکەڵەن، چونکە خوامان لەگەڵدایە.

ئێمە قەت نادەمیزاد ناکەین بەفریارەس، خوا دەکەینە پەناو بەس، نە هاواری

---

(١) رێبیر: مبدأ .

غەیری خوا دەکەین، نە دەپاڕێینەوە لەهیچکەس، لەغەیری خوا ناترسین و تەنها ترسی خوامان هەس، چونکە خوامان لەگەڵدایە.
ئێمە تفاقی شەڕمان بەهێزترە، چەکمان کاریگەرترە، دڵمان چەسپاوترە، بەرنامەمان راستترە، چونکە خوامان لەگەڵدایە.
ئێمە زۆرترو بەرێزترو بەشکۆترو سەرکەوتوترین، چونکە خوامان لەگەڵدایە.
ئەبوبەکر! چیدی شپرزە مەبەو خەم و پەژارەت رادە، دڵتەنگیت بتارێنەو بێهوایی لەدڵ لادە، چونکە خوامان لەگەڵدایە.
ئەبوبەکر سەرهەڵبڕەو چاو لەرەحی خودا ببڕە، ئارامیت بەدڵ وەربێتەوەو دەرونت هێور بێتەوە، چونکە خوامان لەگەڵدایە.
ئەبوبەکر موژدەت دەمێ بەسەرکەوتن، بێبڕوایانیش بەزەبونی و وەژێرکەوتن، بڕوانە ئاسۆ، هەربینا خۆری رزگاری هەلات، خەڵك بەلێشاو بەرەو دین هات، چونکە خوامان لەگەڵدایە.
هەربینا بەیانی، ئاڵای بەرزی ئیسلام شەکایەوە، ناوبانگی بانگەوازی لە دنیا دەنگی دایەوە، خەڵك لە گشت لا بەرەو پیری هاتن و زوڵم و زۆری بڕایەوەو کڵپەی خوانەناسی دامرکایەوە.. چونکە خوامان لەگەڵدایە.
هەربینا بەیانی، خەڵکانی سەر روی زەمین گوێیان بەدەنگی بانگ و ئاوازی خۆشی قورئان ئاشنا بو.. چونکە خوامان لەگەڵدایە.
هەربینا بەیانی، مرۆڤایەتیمان لە تاریکایی رزگار کردو تەواوی خەڵکانی دنیامان لە بتپەرستی ئازاد کرد، چونکە خوامان لەگەڵدایە.

## وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ:

# بەڕاستی تۆ لەسەر خوڕەوشتێکی مەزنی

سوێند بەخوا، تۆ ڕەوشت بەرزو چاك و پەسندی، ئاكار پیاوانەو جوامێرو ڕەندی، پەروەردە پاك و لەبەر دلانی، ڕەفتار مەردانەو شیرن زمانی.
سوێند بەخوا، تۆ بەشەرم و شكۆی، خاوەنی سۆزو بەزەیی ئەوتۆی، لەهەمو دنیا تاقانە هەر تۆی. ڕێژین پاك و بێ پەڵەی، لەگەڵ خەڵكی بەحەوسەڵەی، دژ بەڕێی ناڕاست و هەڵەی.
سوێند بەخوا، تۆ شاگوڵی نێو گوڵزاری ڕەوشتانی، كانگەی بەخشین و پیاوەتی، بەرەبەیانی بەرەكەتی، لوتكەی چاكەو میهرەبانی.
تۆ ڕەوشت بەرزێكی ناوازەی، ئەو ئینسانە ڕێك و سازەی، كە ستەمیان لێكردوی ئارامت گرتوە، ئازاریان داوی لێت بوریون، قسەی ڕەقیان پێگوتوی بەنەرمی وەڵامت داونەوە، جوێنیان پێداوی گوڵت تێگرتون.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

پاشاو گەدا، گەورەو بچوك، ژن و پیاو، دەوڵەمەندو هەژار، نزیك و دور خۆشیان دەوێی، چونكە تۆ میهرەبانی، بەرەفتاری دڵسۆزانەت دلانت شەیدا كردوە، بەسای باشی و چاكیەكانت روحەكانت یەخسیر كردوە، بەسای بەخشندەیی و پیاوەتیەكانت گەردنانت كەچ كردوە.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

سروش، پاك و پوختەی كردوی، جبریل فێری كردوی، پەروەردگار ڕێی نیشان دای و چاودێری كردوی و ئاگادارت بوەو سەرفرازی پێ بەخشیوی.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

لفت ولێوت بەخەندەو پێکەنینە، لابەری ئێش و ئازاری بەتینە، روخسارو سیمای پاکت خەمرەوێنە، دەرمان و هەتوانی دەردو برینە، سیمات دلان دەلاوێنێ، نیگات پڕشنگ دەبارێنێ، لەپت فەڕی لا هەڵدەڕژێ، دەستت چاکە دوەشێنێ. بەرچاوتێری و دەهندەیی، ئەبەد لێت جیا نابێتەوە.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

درۆ ناکەی، ئەگەرچی تیغی شمشێریش لەسەر پەڕەی ملت داندرا بێ، گزی ناکەی ئەگەرچی تەواوی دنیاش لەبەر دەستت ڕاخرا بێ، زوڵم ناکەی ئەگەرچی پاشایەتیشت پێ بسپێرن، چونکە تۆ پێغەمبەری پاك و بێبەری، گوناح لێت دورەو لە گوناح دوری، ڕابەری ڕاست و ڕێ پڕ لە نوری.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

ڕاستگۆی ڕاست وەدەرخەری گەرچی لەم پێناوەدا سەریش نێیتەوە، ئازاو بەجەرگ و مەردی گەرچی شێریش لەروت قیت بێتەوە، جوامێرو بەخشندەو سەخیی گەرچی هەرچی لە دەستتایە لێتبخوازن، وەك ئەوانە نی کە بە پارەوپول دەنازن، تۆ وێنەی هەرە بەرزی بەرچاوانی، هێمای هەرە بالای بەردلانی.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾

لە پێشی پێشەوەی ئادەمیزادانی، لە هەموان بەدینترو سەنگینترو دەسپاکتری، لە هەموان زاناترو دلاواترو بەرێزترو نەجیمزادەترو ئازاترو ئامادەی قوربانیدانی.

﴿ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴾

نەخێر شێت نی، بگرە دەرمانی دەردی شێت و شێواوانیشی. نەیاران و دوژمنان لە سۆنگەی شەڕەنگێزی و بەدفەڕیەوە ئەم بەندوباوەیان پێ هەڵدەبەستای. ئەوانەی کە لامل و سەرسەخت و دژ و ناحەزی تۆن شێت و شێواو و بێنرخ و عەقڵ پوچ و سەرەڕۆن.

﴿ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴾

مەحاڵە تۆ شێت بی، لەکاتێکا خێوی[1] کامڵترین عەقڵ و پێگەیشتوترین دەرون و ڕاست و ڕەوانترین ڕاوبۆچون و مەزنترین دانایی و ڕوناکترین ڕۆشنبینی!

نەخێر تۆ شێت نی، تۆ سروشت وەرگرتوە تا تلخی لاڕێیی ڕادەی، پەردەی تاریکی لادەی، ناهەقی تارومارکەی، نەفامی بسڕیەوە، ڕێنوێنی بە ئاوەزان بدەیەوە و ڕێگا ڕوناك بکەیەوە!

نەخێر تۆ شێت نی، چونکە تۆ لەسەر هیدایەتی پەروەردگاری، ڕوناکی خوات لەلایە کە قورئانە، خاوەن بەرنامەیەکی بڕواپێکراو و بێخەوشی، دینێکی ڕاست و ساغت هێناوە، بانگەوازێکی هۆشمەندانە رادەگەیەنی. خودا تۆی لەشێتی پاراستوە، بگرە تۆ خاوەنی تەواوترین عەقڵ و ڕێکوپێکترین هۆش و جوانترین بۆچون و چاکترین بەرچاوڕونیت، پیتۆلان بەسای تۆوە ڕێڕون دەبن، دانایان بەدانایی تۆ ڕێیایان ڕوناك دەبێتەوە، ئەوانەی کە هۆشمەندو ڕوناکەڕێن بەپێی ڕێوشوێنی تۆ ڕێگایان گرتۆتەبەر.

ئەوانەی تۆیان بەشێت وەسف دەکرد، درۆزن بون و درۆیان دەکرد، چونکە تۆ دنیات پڕکرد لە دانایی، دادو دادگەریت بلاوکردەوە. ئاوەزو ژیریت دایەوە مەردوم. جا ئاوەزو ژیری و دانایی لەکوێ هەیە مەگەر لای تۆ! خێرو بەرەکەت لەکوێ هەڵدەڕژێ مەگەر لە کانی تۆ! تۆ لە زانایان زاناتری، لە دانایان داناتری، لە جوامێران جوامێرتری.

مەحاڵە محمد (صلی الله علیه و سلم) شێت بێ، لەکاتێکا چاکترین کلتوری پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردوە، ڕوناکترین گەنجینەی بۆ خەڵکی بەجێهێشتوە، موبارەکترین پەیامی بە بونەوەران ڕاگەیاندوە.

---

[1] خێو: خاوەن.

## وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ

## بێگومان تۆ بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنوێنی دەکەی

ئەی موحەممەد ئەرکی تۆ روناککردنەوەی رێگاکانە، پیشەی تۆ شارەزاکردن و ڕێنیشاندانە، کاری تۆ چاکردنی باری خەڵکانە.

تۆ رێبەری راستەڕێگای. تۆ تلّخی گومانی ناخان دەپروێنی، ژەنگی گوناهی سەر دلان دەڕوشێنی، پەردەی تاریکی سەر چاوان دەسمێنی، خەڵك لەرێی گومرایی دور دەخەیتەوە، دادگەری دەچەسپێنی و ناڕاستی دەپوچێنی.

تۆ ڕێبەری ڕاستەڕێگای. ئەوانەی شەیدای بەختەوەرین با شوێن پێی تۆ هەڵگرن، ئەوانەی ئەشقی سەرفرازین با تۆ بکەن بەپێشەوا، ئەوانەی رێبواری رێی ئازادین با مەشخەڵی تۆ بگرنە دەست.

تەواوترین نوێژ نوێژی تۆیە، تەواوترین رۆژی رۆژی تۆیە، پوختەترین حەج حەجی تۆیە، پاکترین بەخشین بەخشینی تۆیە، مەزنترین یاد یادەکانی تۆیە.

تۆ ڕێبەری ڕاستەڕێگای. ئەوی سواری کەشتی تۆ بو دەربازی بو، ئەوی بو بە میوانی دیوەخانی بانگەوازی تۆ چێژ و خۆشی ئامبازی بو، ئەوی دەستی بەپەتی پەیامی تۆ گرت سەرکەوتن بەخت و بازی بو.

ئەوەی ڕێی تۆی گرتەبەر، قەت نەشێوا، گومڕا نەبو، ڕیسوا نەبو، زەبون نەبو. جا چۆن ریسوا دەبێ لەکاتێکا سەرکەوتن بەلای تۆ بێ! چۆن گومڕا دەبێ کە ڕوناکی لەلای تۆ بێ! چۆن دەشێوێ لەکاتێکا هۆشمەندی لە سەرچاوەی تۆ هەڵچۆڕێ! چۆن زەبون دەبێ لەکاتێکا خودا پشت و پارێزگارو پەنای تۆ بێ!

تۆ ڕێبەری ڕاستەڕێگای. چونکە تۆ دەگەڵ سروشتی ئینسان هاوسازو هەماهەنگی، وێڕای ئەمە دینێکی تەواو و ڕاست و ڕەوان و بەرنامەیەکی پاك و بێگەردو ڕێوشوێنێکی بێکەم و کورتیشت هێناوە.

ئەقڵت لە شێوان دورخستەوە، دڵت لە گومان مشتومالّ کرد، ویژدانت لە گزی خاوێن کردەوە، ئوممەتت لە تاریکی دەرهێنا، مرۆڤایەتیت لە چنگی زۆرداران ڕەها کرد.

تۆ ڕێبەری ڕاستەڕێگای. وتەکانت، ڕەوشەکانت، کردەکانت، ڕێبازو بیرو ڕاکانت ڕێنماییـن.

تۆ هیدایەتدەری بۆ ڕێگەی خوا، ڕێنیشاندەری بۆ ڕاستی و ڕەوا، ڕێبەری ڕێی چاکەخوازی، بانگڕابێژی بۆ بەهەشت و سەرفرازی.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ :

## ئەی پێغەمبەر ئەوی بۆت دابەزیوە ڕایگەیەنە

پەیامەکەت بەتەواوی وەك بەتەواوی گوێبیستی بوی ڕایگەیەنە، بەبێ کەموکورتی وەك پێتگەییوە بیگەیەنە، تەنانەت پیتێکیشی لا کەم مەکەوە، وشەیەکیشی لا ڕەش مەکەوە، ڕستەیەکیشی لا پازمەدە.
هەرچی بۆت نێردراوە، چونکە سپاردەیەکی خودایەو ئۆبالی لە ئەستۆی تۆ دایە، هەموی چ وەك دەق، چ وەك ڕوح و ناوەڕۆك ڕاگەیەنە.
هەر چ شتێکی لەو سروشە مەزن و ڕێنماییە ڕاست و بەرنامە بێگەردەی بۆت دابەزیوە بیگەیەنە، تۆ هەر تەنها گەیەنەری و هیچی تر، بۆیە پیتێکیش لە پەیامەکەت زیاد مەکە، لەخۆتەوە زێدەی تێمەخە، دەستکاری ناوەڕۆکەکەی مەکە، چونکە تۆ هەر تەنها نێردراوێکی و هیچی تر، پەیامبەرێکی و هیچی تر، ئەرکەکەت ڕاگەیاندنەو لێی بەرپرسیاریشی، کەواتە وەك بیستوتە بیگەیەنەو وەك وەرتگرتوە ڕایگەیەنە.
هەرچی بۆت نێردراوە بیگەیەنە، جا ئەگەر کەسێ مەبەستی بێ بیناسێ هەر دەیناسێ، نکوڵیشی لێبکات هەر لێی دەکات! کەسێ بیەوێ لەئامێزی بگرێ هەر دەیگرێ، ڕوش وەرگێڕێ هەر وەریدەیگێرێ! کەسێك بیەوێ لێی بێتە پێش هەر دێتە پێش، کەسێکیش پشتی هەڵکا هەر هەڵیدەکا.
هەرچی بۆت نێردراوە بیگەیەنە، بە هەمو کەسێکی ڕاگەیەنە، سەرجەم خەڵکی بانگ بکە، هەمویان ئامۆژگاری بکە، دەسەلاتدارو بێدەسەلات، پاشاو گەدا، ئاغاو جوتیار، ئادەمیزادو جنۆکە، پیاو و ژن، گەورەو گچکە. هیچ کەسێکیان هەڵمەبوێرە.

هەرچی بۆت نێردراوە بیگەیەنە.. لە دوژمن و ناحەزو بێبڕوایان مەترسە، لە لەشکری تەیارکراو، لە شمشێری هەڵکێشراو، لە ڕمی ئاراستەکراو، لەسەرنانەوەی بە دەردەسەری، لە مەرگی بە دژواری و لە شالاوی بێئامان باکت نەبێ.

هەرچی بۆت نێردراوە بیگەیەنە، ماڵی دنیا فریوت نەخوا، پلەوپایە مەستت نەکا، پشتوپەنا لەخشتەت نەبا، چێژ و خۆشی تەفرەت نەدا، کاڵای[1] دنیا نەتخەڵەتێنێ، شەرم و دودڵی نەتوەستێنێ.

ئەگەر بەتەواوی پەیامەکەت نەگەیەنی، واتا هیچت بەهیچ نەکردوە، ئەگەر بەبێ کەموکورتی ڕاینەگەیەنی، واتا ئەرکی خۆت ڕانەپەڕاندوە. خۆ ئەگەر وتەیەکت لا شاردەوە یا دەقێکیت لەکارخست یا دەستەواژەیەکیت فەرامۆش کرد، واتا پەیامی خوات نەگەیاندوەو ڕاسپاردەی خوات رانەسپاردوە. خوا دەیەوێ پەیامەکەی وەك چۆن جبریل هێناویەتی و پێتگەییوەو دڵ و هۆشت تێیگەییوە، ئاواش بە سەرجەم خەڵکانی بگەیەنی.

---

(١) کاڵا: متاع .

## وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ :

## خوا له خه‌ڵكی ده‌تپارێزێ

بێ كه‌موكورتی، په‌یامه‌كه‌ت بگه‌یه‌نه‌و له‌هیچكه‌سێ ترست نه‌بێ، چونكه ئێمه‌ت له‌گه‌ڵدایه‌، چاومان لێته‌و رێگه‌ نادەین ناحه‌ز زه‌برت لێوه‌شێنێ، كه‌س ناتوانێ گوڵی ژیانت هه‌ڵپروێنێ، كه‌س ناتوانێ روناكایی په‌یامه‌كه‌ت بتارێنێ، كه‌س ناتوانێ ببێته‌ به‌ربه‌ستی رێبازی تۆ و كردوكۆشت بسره‌وێنێ، چونكه خوا له‌به‌دیی به‌دكارو دوژمنان ده‌تپارێزێ. بانگه‌وازه‌كه‌ت به‌رون و ئاشكرایی راگه‌یه‌نه‌و وشه‌كانت به‌بێ ترس ده‌ربڕه‌و بزانه‌ كه خوا له‌نیازپیسان ده‌تپارێزێ. بانگه‌وازه‌كه‌ت بۆ خه‌ڵكی رون بكه‌وه‌، په‌یامه‌كه‌ت ڕابنوێنه‌، ده‌نگت به‌ڕاشكاوی هه‌ڵبڕه‌و به‌رنامه‌كه‌ت ڕاگه‌یه‌نه‌، ئیتر بێخه‌م به‌خوا له‌ نامه‌ردان ده‌تپارێزێ.
ته‌واوی هێزه‌كانی دنیا كۆببنه‌وه‌ ده‌روه‌ستت نایه‌ن، سه‌رجه‌م سه‌رسه‌خت و سه‌ربزێوان له‌ دژت بوه‌ستن چۆكت پێناده‌ن، سه‌رجه‌م بێبڕواو له‌ خوا یاخییان یه‌ك ده‌سته‌ ڕوبه‌ڕوت ببنه‌وه‌ بارت نابه‌ن.

*دوژمنی سه‌رسه‌خت و به‌ جه‌به‌روت*
*چیتر نه‌یتوانی بكه‌ڕێ له‌دوت*
*بێخه‌م به‌، خوایه‌ په‌نا و پارێزت*
*موعجیزه‌ی تۆیه‌ ته‌ونی عه‌نكه‌بوت*

## أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ:

## مەگەر سینەمان فرەوان نەکردی!

سینەمان وا فرەوان کردی تاهێند گوشادو بەرهەراو بو، نیتر تەنگی و شپرزەیی و خەم و داخی تێدا نەماو پڕ بو لەنورو فەرەحنایی.
سینەمان وا فرەوان کردی تا سەرڕێژ[1] بو لە ئیمان و چاکەخوازی، لە میهرەبانی و دانایی.
سینەمان وا فرەوان کردی تائیتر توانیت لەمەڕ خوڕەوشتە جیاوازەکان بەگونجاوی رەفتار بکەی، ئەگەر کەمتەرخەمیەکیان هەبوایە لێت دەبورین، ئەگەر هەڵەیەکیان بکردایە چاوت لێدەپۆشین، ئەگەر لەکەیەکیان هەبوایە داتدەپۆشی، ئەگەر کارێکی نەشیاویان لەئاست تۆدا بنواندایە بەنەرمی لەگەڵیان دەجولایەوە، لەگەڵ نەزان و نەفامەکان پێدانەدەچوی و بەگژیان دانەدەچوی، لە ئاست بێدەسەلات و لانەوازانیش میهرەبانیت دەنواند.
سینەمان وا فرەوان کردی تاوەك بارانی بە بەرەکەت و وەك دەریای بەفەرِوفیت و وەك سروەی بەزەیی هەڵکەوتی، داوای داواکارانت رەت نەدەکردەوە، خواستی خوازیارانت جێبەجێ دەکرد، مرازی دلانت وەدی دێنا، کەست بێهومێد نەدەکردو هەرکێ روی تێکردبای بەدڵخۆشی بەرێت دەکرد.
سینەمان وا فرەوان کردی تا هێند فێنك و بێوەی بو، وشەی ئاگرین و پڕ لە تورەییت دامرکاندەوە، تانەو توانجت رەواندەوە، بەنەرم و لێبوردەیی باگۆی قسەی هەڵەو پڕ پەڵەی بە رق و کینەت دایەوە.

---

(١) سەرڕێژ: شتێ پڕ بێ و لێی هەڵڕژێ.

سینەمان وا فرەوان کردی تا لەئاست هەڵوێستی وشك و کەللەپوچانەی بیابانشینان و تیلەو توانجی بێمروەتان و کەشوفشی یاخییان و دەمدرێژی و فشەفشی هەرزەگۆیان و لالوتی و نابیستەیی لوتبەرزان و بوغزو غەرەزی حەسودان و تیروتانەی دەمشڕان و پشتتێکردنی خزمانت، بەوپەڕی جوانی ئارامت گرت.

سینەمان وا فرەوان کردی ئیتر لەقەیرانان نەشێوای و زەردەخەنەت لەسەر لێوان دەپشکوت، لەمەڕ موسیبەتی داهەژێنا بێباك بوی و پێدەکەنی، لەنێو گەرمەی رەشەبادا نەپەشۆکای و هەر هێور بوی، لەئاستەنگ و ناخۆشیاندا نەشڵەژای و هەر ئارام بوی، بەلا لەدەورت دەگەڕا کەچی هەر سەقامگیرو خۆڕاگر بوی .. چونکە سینەت بەسروشی خوا فرەوان کراوە، دڵت بەیادی خوا ئاوەدان کراوەتەوەو زیندوێتی بەناخت بەخشراوە.

سینەمان وا فرەوان کردی، ئیتر هەرگیز ڕوگرژ و دڵڕەق و مڕومۆچ و دڕدۆنگ[1] نەبوی و کینەت نەنایە سینە، بەڵکو هەمیشە بەسۆزو بەڕەحم و چاکەخوازو بێزەرو دڵنەرم و نیان بوی، خەڵك تۆیان بەسەرچاوەی نەرمونیانی دادەنا، لەرێژینی ژیانی تۆدا فێری جوامێری دەبون و لە دیوەخانی تۆدا لێبوردەیی دەبەشرایەوە.

---

(١) دردۆنگ: ڕوسارد.

وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ :

## گوناهمان لەکۆڵ کردیەوە

هەر گوناهێکی هەتبو هەڵمانوەراندو ئاسەوارمان بڕاندنەوە، ئیتر لە گوناهی پێشین و پاشین پاکبویەوە، ئێستاکە خاوێن و بێگوناح و بێ پەڵەی. هەرچی بیکەی جێی سوپاس و پێزانینە، پیرۆزو ڕەحمەت بارینە، شایەن بەپاداشت و ئافەرینە.
پیرۆزت بێ هەزاران جار ئەم ڕێزانەو سەرکەوتنە، پایەداربێ ئەم بردنەوەو لێبوردنە، چاوت ڕون بێ بەم سەربەرزی و ڕەهابونە.

## ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ :

## ئەو بارە قورسەی پشتی چەماندی

ئەو بارە قورسەمان لادا، کە شان و پیلی شەکەت کردی و پشتت پیّ چەمایەوە، بارت سوك بو هەسایەوە، خەم لەسینەت بڕایەوە، ئەمە خەلاتی خوای میهرەبانە، دەی دڵشادبە بەم شکۆ و شانە، هەداوەر بە بەو موژدە خۆشانەی پڕ لە نیشانە.

وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ :

## یادمان بەرزکردیەوە

یادی تۆ لەگەڵ یادی من دایە، لە بانگ و نوێژ و خوتبەو وتاران کە یادی من دێ یەکسەر یادی تۆشی بەدوایە. جا گەورەیی هەیە لەمە گەورەتر! هەرچی نوێژکەرە یا وتارخوێنە یان یا پاکیخوێنە[1]، یا کە لە حەجێ دایە، گشتی هەر یادت دەکەن . جا کام شکۆ لە ئاستی ئەم شکۆ مەزنە دایە!

لە تەورات و لە ئینجیلدا باسی تۆ کراوە، ناوت لە پەڕاوانی دێرین[2] و لە تێنوسانی[3] زەمانی زودا هاتوە، لە کۆڕو مەکۆیاندا ناوت لەبەر باسانە، لە دێهات و لە شاراندا یادت لەسەر زارانە، لە دیوەخان و مەجلیساندا بە پەسندایی[4] تۆدا هەڵدەڵێن.

یادمان هێند بڵند کردی، تاوەك تاوی هەتاوێ بەسەر زەمیندا گزنگت دا، وەك (با) بەخێرایی بەکیشوەراندا هەڵتکرد، وەك روناکی سەرتاپای دنیات ڕۆشنکردەوە. ئێستا شار نیە ئەتۆ نەناسێ، مەملەکەت نیە ناوت نەبیستێ، گوندو دێ نیە لە تۆ نەپرسێ.

یادمان هێند بڵند کردی، لە ڕێی کاروانان باس باسی تۆیە، چیرۆکی شەوان سەربردەی تۆیە، گفتوگۆی کۆڕان هەواڵی تۆیە، سەرتۆپی دۆزان[5] هەر دۆزی تۆیە، تۆ باسوخواسە مەزنەکەی ئەم گەردونەی.

---

(١) پاکیخوێن: مسبّح .
(٢) الصحف الاولی.
(٣) تێنوس: پەڕاو .
(٤) پەسندایی: پێ هەڵگوتن .
(٥)دۆز: قضیة .

یادمان هێند بڵند کردی، بە تێپەڕبونیساڵ و سەردەمان لەبیران نەبرایەوە، ناوت لە لیستی جاویدانی نەسڕایەوە، لە مێژونامان فەرامۆش نەکرای، لە تێنوسنامان پشتگوێ نەخرای.

خەڵك لەبیرچونەوە بە تەنها تۆ نەبێ، گەلای (ناو)ان هەڵوەرین گەلای ناوی تۆ نەبێ، پیاوە مەزنەکان خرانە لاپەڕگان تەنها تۆ نەبێ. هەرکەسێکی ناوی بڵندبێتەوە بەسای شوێنکەوتەیی تۆیە، هەرکەسێکی بیرنەچێتەوە بەسای پەیڕەوی تۆیە. ئاسەواری دەوڵەتان بڕایەوە تەنها ئاسەواری دەوڵەتی تۆ نەبێ، داستانی سوڵتانەکان ڕەشبونەوە تەنها داستانی تۆ نەبێ، شکۆی پاشایان ڕەوینەوە تەنها شکۆی تۆ نەبێ. هیچکەس نیە سینەی وەك سینەی تۆ بەرهەراو[1] بێ، یادی بەقەد تۆ بڵندو بالا بێ، پایەی وەکو تۆ بەڕێزو شیاو بێ، رابردوی وەك تۆ هێندە بەرچاو بێ، ڕێژینی وەك تۆ جوان و پاراو بێ.

ئەوی شایەتمان بێنێ ناوی تۆش دێنێ، ئەوی شەونوێژان بکا لەگەڵ ئێمەدا یادی تۆش دەکا، ئەوی وتار بخوێنێ ئاماژە بەناوت دەدا. دەی سوپاسی پەروەردگاری خۆت بکە، چونکە ئێمەین کە یادمان ئاوەها بڵند کردی.

---

(١) بەرهەراو: فرەوان .




## سەختی سانایی لەگەڵدایە، بەڵێ سەختی سانایی لەگەڵدایە

ئەگەر هیچ چارت نەماو دنیات لەسەر وێکهاتەوە، دڵنیابە خودا یەکەو دەرگای هەزار، هەر یەکەوجار دەرگایەکت لێدەکاتەوە.
خەمگین مەبەو دڵنیابە، دوای هەژاری دەوڵەمەندیە، پاشی نەخۆشی لەشساغیە، دوای دەردو بەلا سەلامەتیە، پاشی تەنگانە فەرەحناییە، پاشی ناخۆشیش هەر خۆشیە.
تۆ و پەیڕەوانت بەسای ئەم ئاسانیە، بە ئامانج دەگەن، بژێویتان دەستەبەر دەکەن، سەردەکەون، پلەوپایەتان بەرز دەبێتەوە، ڕێی رزگاریتان بۆ دەکرێتەوە، جا نەك یەك ئاسانی بێت و بەس، بەڵکو دو ئاسانیە!
دەستورێکی جێگیرو هەم یاسایەکی سەلمێنراوە کە لەگەڵ هەمو سەختی و تەنگانەیەکدا ئاسانی هەیە. دوای شەوگاران سپێدە دێ، لەو دیو شاخی رك و عاسێ دەشتایی دێ، دوای بیابانی هومێدبڕ مێرگوزاری پڕهومێد دێ، کە گوریس زۆر توند کرا دەپسێ، کە بار تەواو بو هەڵدەگیرێ، ئەوەی نەگەیشتۆتەجێ هەر دەگاتە جێ، نەخۆش هەر دێ شیفای بۆ بێ، بەلابار هەر دێ بەلای لەکۆڵ بێتەوە، زیندانی هەر دێ ئازاد بکرێ، هەژار هەر دێ دەوڵەمەند بێ، برسی هەر دێ تێروپڕ بێ، تێنو هەر دێ زاری تەڕ بێ، خەمگین هەر دێ دڵی خۆش بێ، چونکە خودا لەدوای سەختی سانایی‌شی داناوە.

ئەم سورەتە وەختێك دابەزی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە بارێکی زۆر سەخت بو، دوژمن دەورەیان دابو، ناحەزان گەلەکۆمەیان لێکردبو، خەڵك پشتیان تێکردبو، تەگبیرێکی بەفرو فێڵ لەگەڕدابو، یارو یاوەرانیش ژمارەیان کەم بو. بۆیە دەبو دڵنەوایی و دڵنیایی بێتەخوارێ، بەم بۆنەوە ئەم وشانە بۆ پێغەمبەرو شوێنکەوتوانی دابەزی، کە تا دنیا دنیایەوەك مورژدەیەکی دڵخۆشکەرو بەڵێنێکی سەلمێنەر دەمێنێتەوە.

## فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ :

# کە دەستبەتاڵ بوی، بۆ پەروەردگارت خۆت تەرخان کەوە

ئەگەر کاروبارەکانی خۆت و دنیات جێبەجێ کردو لا بویتەوە، خۆت تەرخان کە بۆ پەرستن، رومان تێکەوەو فەرمانەکانی ئێمە جێبەجێ کە، پتر یادمان بکەرەوەو زیاتر لێمان بپاڕێوە.

ئەگەر لەگەڵ خەڵکی تەواو بویت و پرس و کاری ئەوانت جێبەجێ کرد، لە میحرابی گەورەیی ئێمەدا بوەستەو لەبەردەم دەرگای ئێمەدا بلاڵێوەو نزیك بەوەو سوژدە ببە، تا رزگار بی و ببەیتەوە، ئارام بگری و بسێیتەوە.

ئەگەر لەگەڵ خاوخێزان و منداڵ و خزم و برادەراندا تەواو بوی، کاتێك بۆ ئێمە تەرخان بکەو داواکانت بەرزکەوە، داخوازیەکانت بخەرو، زۆر دوعا بکەو بپاڕێوە، پاکی بخوێنە، لێمان بخوازە، سوپاسمان بکە، یادمان بکەوە، داوای لێبوردنمان لێبکە.

ئەگەر لە کاروباری ئامۆژگاریکردن و دادوەریکردن و ساخکردنەوەی کێشەکان و فەتوادان و فێرکردن و ڕێنیشاندان و تێکۆشان و بەرچاو ڕونکردنی خەڵکیدا تەواو بوی و لێبویەوە، زو وەرەوەو ڕوت بۆ ئێمە وەرگێرەوە، تا بەهێزی مە پشت ئەستورتر بی، لەیارمەتیمان بەهرەمەندتر بی، لە رزقی ئێمە بە تێشوتر بی، بەسەرخستنمان بەختەوەرتر بی.

ئێمە تەنانەت لە خودی خۆشت لە پێشترین، ئێمە لە خەڵکی شایستەترین، کە

خۆت و خولیاتی بۆ تەرخان بکەی. فەرمو سەیرکەن ئەم ئایەتە چەند بەجوانی رێی بە پێغەمبەرو یارانی نیشان داوە، کە لەوەختی بێنیشی و دەسبەتاڵیدا خۆیان بۆ خوا تەرخان کەن و بەیادو پاکیگاری سات و کاتیان بەسەرببەن، تا ئارامی و ئارخەیانی[1]، سەرفرازی و هەدادانی[2]، ئاخیرخێری و پاك و رێکی، ئاوەدانی دنیاو دواییان دەستەبەر بێ و سەروماڵیان پارێزراو بێ.

(١) ئارخەیان: دڵنیا .
(٢) هەدا: ئۆقرە، ئارام .

## وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ :

## لەبەر خوا بلاڵێوە

خواستەکانت تەنها لە خوا بخوازە، هەر ئەوە جێگەی هومێد، تەنها ڕو لە خوا بکە هەر ئەوە پشت و پەنا، هەر ئەو ڕێزانەبەخشەو خاوەنی تۆڵەو سزا، هومێدی گەورە گەورە هەر شایەن بە قەدری ئەوە، هەر خۆی خاوەنی گەنجینەکانی ئەرزو ئاسمانە، هەڵسوڕێنەری گەورەو بچوکی کاروبارانە، هەر ئەو شایەن بە لێخواستن و هاناوەبەربردن و هیوا پێبونە.

ئەم وتە بەپێزو پیرۆزانەوەختێ بۆ پێغەمبەر هاتنە خوارێ، کە سەختی شەنگیان لا بڕیبو بەجارێ، ئەم وشە جوان و پڕشنگدارانە بونە سارێژی زام و برینی، بونە هەوێنی ئارام و هەدادانی، ئاسمانی دڵیان روناك کردەوەو خەم و خەفەتیان لەبیر بردەوە.




## دەرگاکانمان بۆ ئاوەلا کردی، ئاوەلابونێکی ڕونی بەرچاوان

ئەی محمد (صلی الله علیه و سلم) دەروی رون و دیارو موبارەك و ڕۆشنمان لێکردیەوە، دەرگای دلانمان بۆ ئاوەلا کردی و تۆوی ئیمانت تێدا چاندن، ویژدانەکانمان بۆ کردیەوەو چاکەناسیت تێگەیاندن، دەرونەکانمان بۆ کردیەوەو دەنگی ڕاستیت تێدا بەرزکردەوە، سنوری ولاتەکانمان بۆ کردیەوەو هیدایەتت بلاوکردەوە، هەروەها گەنجینەی مەعریفەو دەرباری زانست و کۆگای سەرکەوتنمان بۆ کردیەوە. بەهۆی بانگەوازەکەت دلانی پەردەپۆش و چاوانی کوێرو گوێی کەرو زمانی لاڵمان بۆ ڕەها[1] کردی. کۆسپەکانمان بۆ تەخت کردی و پەیامی تۆمان بە سەرجەم مرۆڤ و ئەجندان گەیاند.
دەرومان لێکردیەوە، ئیتر زمان و زاری پیرۆزو ڕەوانت زانستی پڕ لەسودی لێهەڵڕژا، دڵ و دەرونی پاك و پاراوت شەپۆڵی هیدایەتی تێدا هەڵکشا، لەناو لەپی موبارەکت خێرو بەرەکەت وەك گولاو پڕژا.
دەرومان لێکردیەوە، ئیتر چەندین غەنیمە کەوتە بەردەستت، رزقێکی پاك و زۆر بوە بەشت، هیچت بۆ خۆت نەهێشتەوەو گشتت دا بە خەڵك و یارو یاوەران و خزم و کەست.

(١) ڕەها: ئازاد .

دەروی زانستمان لێکردیەوە، ئیتر زاناکان ڕویان تێکردی و لە دەریـــای تۆوە بەهرەوەر بون، کەچی تۆ نەخوێندەواری و نازانی بنوسی و بخوێنیەوە.
دەروی خێرمان لێکردیەوە، ئیتر خزمانت بەسەرکردەوە، دەستی یارمەتیت بۆ درێژکردن، برسیت تێرکرد، ڕوت و بێبەرگت پۆشتەکرد، دڵی گرفتارانت دایەوە، هەژارانت دەوڵەمەندکرد، هەڵبەت هەموی بەسای ڕزق و ڕێزانەو چاکەی ئێمەوە.
دەروی قەلاکان و دەروازەی گوندو شارانت بۆ کرایەوە، ئیتر دینەکەت زاڵ و دینی ناڕاستی وانیش توایەوە، ئالاکەت هەڵکراو شەکایەوە، دەوڵەتەکەت سەرکەوت و مایەوە، بێبڕوایی و زوڵم و زۆری بنی هات و بڕایەوە.
دەروی هەمو خێرو بەرەکەت و ڕێزو چاکەو سەرکەوتنێکت لاکرایەوە.

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾

بزانە کە خوا یەکەو بێ هاوبەشە، هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەی، بۆ کەسی تر هانا نەبەی، ئەو بپەرستە لەو بترازێ بەندایەتی بۆ کەس نەکەی، خواست و نیازت بەوی هەڵپەسێرە، تەنها لەوی بپاڕێوەو دەست بۆ غەیری ئەو ڕانەخەی، لالانەوەت هەر لەوی، پشت و پەنات هەر بەوی، ئەو شایەنی پەرستنەو لەو بترازێ بۆ کەسی دی دانەنەوی، لەو بترازێ کەس ناتوانێ دەردو بەلایان لابەرێ، بێچارە بێچارەیە ئەگەر بۆ غەیری ئەو هانابەرێ.
بزانە کە خوا یەکەو بێ هاوبەشە، هەر ئەو شایەن بەسوپاس و پاکییە، لە هەمو دەسەلاتداران میهرەبانترە، لە گشت بەخشەران بەخشندەترە، لە تەواوی تواناداران دلۆڤانترە، لە سەرجەم تۆڵەستێنان تۆڵەستێنترە، کەس وەکو ئەو گەورە نیە، کەس هێندەی ئەو بەرز نیە، نابێ هاواری خواوەندێکی تر بکرێ، نابێ ملکەچی پەروەردگارێکی تر بکرێ، هەر دەبێ هەر ئەو خوایە مەزن و خاوەن توانایە بپەرستی و لێی بترسی و خۆشت بوێ و فەرمانەکانی جێبەجێ کەی کە خوایەکی بە هەق و ڕاستەقینەیە.
بزانە کە خوا یەکەو بێ هاوبەشە، هەر خۆی خاوەنی جوانی بێوێنەو سیفەتی تەواو و سامی بێسنورە، بونەوەرانی هێناوەتەدی تا بیپەرستن، مرۆڤ و جنۆکەی

ئەفراندوه تا ملکەچی بن و فەرمانەکانی جێبەجێکەن. جا ئەوەی گوێڕایەڵی خوا بێ لێی رازی دەبێ، ئەوەی خوای خۆش بوێ لە خۆی نزیکی دەخاتەوە، ئەوەی لە خوا بترسێ لە سزا دەپارێزێ، ئەوەی خوا بەگەورە بگرێ رێزی دەگرێ، ئەوەی لە خوا یاخی بێ دەیخاتە ئەشکەنجەوە، ئەوەی دژایەتی خوا بکا لە ڕیسوایی نوقمی دەکا، ئەوەی یادی خوا بکا یادی دەکاتەوە، ئەوەی سوپاسی خوا بکا زیاتری پێدەبەخشێ، ئەوەی بێبڕوا بێ زەبونە دەکا، فەرمان فەرمانی ئەوەو سەرەنجام بۆ لای ئەوە.

بزانە کە خوا یەکەو بێ هاوبەشە، بە تاك و تەنیایی بیپەرستە چونکە هاوبەش قبوڵ ناکا، کاروبارت بەو بسپێرە چونکە زاڵی هەرەزاڵەو خاوەن هێزی بێزەواڵە، داواکانت لەو بخوازە ئەو دەوڵەمەندی بێهاوتایە، لە سزای ئەو بترسە، چونکە سزاکەی توندوتیژە، لە تۆڵەسەندنەوەی وریابە چونکە تۆڵەی بە ئازارە، سنورەکانی مەبەزێنە چونکە لەکەس قبوڵ ناکا، دژایەتی دۆستانی مەکە چونکە تۆڵەیان بۆ وەردەگرێتەوە، داوای لێخۆشبون لەوی بکە چونکە خاوەن لێبوردەیی فرەوانە، چاوت لە ڕێزو فەزڵی ئەو بێ، چونکە ئەو ڕێزبەخشێکی بێمنەتە، بە گەورەیی ئەو پەنا بگرە ئاسایشت دەپارێزرێ، هەمیشە یادی بکە تا خۆشویستنی بەدەست دێنی، هەمیشە سوپاسی بکە تا پتر بەهرەمەند بی بە بەخشینی، دروشمەکانی بەرز راگرە تا پاڵپشتی بەدەست بێنی، لەگەڵ دوژمنانی شەڕ بکە تا سەرکەوتنت پێببەخشێ.

## اقْرَأْ :

## بخوێنـە

سەربردەی پێغەمبەرایەتی بە وشەی (بخوێنە) دەسپێدەکا، کە یەکەمین وشە بو لە ئەشکەوتێدا بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان هاتە خوارێ.
ئێمەش لەگەڵ سەرەتای وشەی (بخوێنە)دا سەرەتامان کردەوە، لەگەڵ مێژوی وشەی (بخوێنە)دا ژیان و شکۆ و مێژو و ڕێبازی پیرۆزمان دەستی پێکرد، جیهان وەرچەرخانی بەخۆیەوە دی و ئەدگارەکانی گۆڕان و رۆژێکی نوێی لێبوەوە.
ئەو ساتە بەختەوەرترین ساتی ژیانی ئێمەی موسڵمان بو، ساتی جودابونەوەی ڕوناکی لە تاریکی و بڕواداری لەبێبڕوایی و زانست لە نەزانین بو.
دیارە کە هەڵبژاردنی وشەی (بخوێنە) لەنێو ئەم هەمو هەزاران هەزاروشانەی کە لە فەرهەنگی وشان و لە دیوەخانی زماندا هەن رازێکی ناوازەو سەرنجێکی سەرسوڕمێنی تێدایە. هیچ وشەیەکی وەك: بنوسە، گاسکە[1]، بدوێ، بڵێ، وتار بدە. شان لە شانی نادەن و جێی ناگرنەوە. (بخوێنە) وشەیەکی جیاوازو دانسقەو جوان و ڕەسەن و بەسامە.
ئەی محمد (صلى الله علیه و سلم) بخوێنە بەرلەوەی بانگی کەس بکەی، فێربە بەرلەوەی هیچ کارێ بکەی

﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ ﴾[2]

---

(١) گاسکە: بانگ بکە .
(٢) (محمد - ١٩).

بزانە کە خوا یەکەو لە گوناهت لێبوردن بخوازە[١].

(بخوێنە) بەرنامەی ژیان و پەیامێکی زیندوە بۆ هەمو ئەوانەی کە زیندون و مەبەستیانە زانستی سودبەخش و ماریفەت فێربن و، نەزانی و بێئاگایی لەبارەی خۆیان و گەلەکەیان وەلا نین.

جا هەیاران محمد (صلی الله علیه و سلم) لە کوێ بخوێنێ کە نە مامۆستایەکی هەیەو نە کتێبێکی خوێندۆتەوەو نە دەشزانێ قەڵەم بگرێ!

یەکەمجار با بەناوی خواداوتەکانی پەروەردگاری بخوێنێتەوە، با لە کتێبی کراوەی گەردوندا دێڕەکانی دانایی بخوێنێتەوە کە بە قەڵەمی توانایی نوسراون، با خۆری تیشکدارو ئەستیرەی بریسکەدارو جۆگەو ڕوبارو گردو شاخ و مێرگ و بیابان و ئەرزو ئاسمانان بخوێنێتەوە.

وشەی (بخوێنە) پلەو پایەو بەرزیی زانستت پێنیشان دەداو پێتدەڵێ یەکەمین قۆناغی شکۆی سەروەری خوێندنەوەیە.

هەمو بەختەوەری و سەرفرازبونێك بەهۆی زانستەوەیە، پەیامی پەیامبەری خۆشەویستیشمان هەم زانستی و هەم کرداریشە، چونکە خوا بە زانستی سودبەخش و کردەوەی چاکەوە بۆ خەڵکی ناردوە:

مثل ما بعثني الله به من الهدى والعلمِ كمثل الغَيثِ[٢]

من و ئەو هیدایەت و زانستەی کە خوا پێی ناردوم وەکو بارانی پڕ بەرەکەت وایە.

---

(١) بێگومان پێغەمبەران، بەتایبەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه و سلم)، خوا بەجۆرێك دروستی کردوون، کە ئارەزووی گوناهیشیان نەبووە، چ جای کردنی ئەو شتانەی، کە بریتیە لە بە گوناه ناوبراون. بەڵکو گوناهی ئەوان بریتیە لەو کەموکوڕیە، بە بوونیانە بەرامبەر بەخوا، کە بریتیە لە کردنی شتێك، کە حەرامو قەدەغە نەبووە، بەڵام نەکردنی چاکتر بووە، ئەو جۆرە شتانە هەرچەند گوناهو تاوان نین، بەڵام شایانی پلەوپایەی بەرزی ئەوان نین، لەبەرئەوە بۆ ئەوان بە گوناه ناوبراون.

تەفسیرەکەی عوسمان عبدالعزیز، ئایەتی (واستغفر لذنبك)، جزمی (٢٥-٢٦)، ل٢٣٠.

**ئەوا محمد سعید**

(٢) أخرجه البخاري ٧٩ ومسلم ٢٢٨٢ عن أبي موسى رضي الله عنه.

جولەکەکان زانستیان هەبو بەڵام بێکردەوە بون، بۆیە کەوتنە بەر توڕەیی خوا، دیانەکان کردەوەیان هەبو، بەڵام بێ زاست بون، بۆیە گومڕا بون، جا خوا فەرمانی پێکردوین کە خۆمان لەوان بەدور بگرین:

﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾[1]

نەك ئەوانەی بەر توڕەیی خوا کەوتون، نە ئەوانەش کە گومڕان.

---

(١) (الفاتحة - ٧).

# گریانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)

گریان لە کاتی هەستکردن بە کەمتەرخەمی یا ترسان لە چارەنوسی ئەبەدی کارێکی ڕەواو پەسندە، بەندە گەر یادی خوا بکاو لە گوناحەکانی بترسێ شتێکی ستایشکراوەو بەڵگەیە لەسەر تەقوای دڵ، لەسەر دەرونبەرزی و ویژدان پاکی و سۆزی بەکوڵ .

خوا مەدحی پێغەمبەرانی کردوە بەوەی کە گریاون:

﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَٰنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ [(١)]

کە ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا دەخوێنرایەوە، دەمەورو دەکوتنە زەوی بۆ سوژدەبردن و بەکوڵ دەگریان.

بەمجۆرەش وەسفی دۆست و خۆشەویستانی کردوە:

﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾ [(٢)]

دەمەورو بۆ سەرزەوی نخون دەبونەوەو پتر ترسی خوایان لەدڵدا بەرقەرار دەبو.

سەرکۆنەی ناحەزانیشی کردوە بەوەی کە دڵرەق و توندوتوڕەن

﴿أَفَمِنْ هَٰذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ۝٥٩ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ﴾ [(٣)]

ئاخۆ لەم وتارە سەیرماون؟ پێدەکەنن و ناگریەن؟

ستایشی ئەم گەلەشی کردوە کە ئەمە یەکێك لە ئاکارەکانیانە:

---

(١) (مریم - ٥٨).
(٢) (الإسراء - ١٠٩).
(٣) (النجم -٦٠).

﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾[١]

کە گوێیان لەو ئایەتانە دەبو کە بۆ پێغەمبەر دابەزیوە، دەتدی چاویان فرمێسکی لا هەڵدەڕژی، چونکە لەراستیەکە دەگەن.

پێغەمبەری خۆشەویستمان سەروەری لەخواترسان و پێشەوای خۆپارێزان بو، هەمیشە پێڵوی چاوەکانی تەڕ بو، فرمێسکەکانی بەخوڕ بون و بە پاك و بێگەردی هەڵدەڕژان، دڵ ناسك و پەندوەرگر بو، سۆزی بە جۆش و بە کوڵوکۆ بو، خاوەنی هەست و هۆشێکی زندو بو، کە لەیادی خوا رۆدەچو و لەگەورەیی خوا رادەما دەیدایە پڕمەی گریان، گریانی خۆشەویستمان گەلا کاریگەری پەروەردەیی دەنایەوەو دڵی یارانی پتر پەیوەست دەکرد بەرێی چاکەو خواپەرستی، تەنانەت خوتبەی دەرون کوڵێن و وەعزی هەست بزوێنیش ئەو رۆڵەیان نەدەگێڕا، خۆشەویستمان لە وەختی قورئان خوێندندا دەگریا، تەنانەت جارێکیان لە شەونوێژێدا هەر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:

﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[٢]

ئەگەر بتەوێ ئازاریان دەی، بەندەی خۆتن، ئەگەر بشتەوێ لێیان خۆش بی، هەر خۆت دەسەلات بەدەست و هەرەدانای.

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم ئایەتەدا دەگریا تا زۆربەی شەوەکەی بەوجۆرە بردە سەرێ.

کە گوێی لە قورئان دەگرت دەگریا، جارێکیان بە ئیبنومەسعودی فەرمو: قورئانم بۆ بخوێنە، ئەویش بە سەرسامیەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆ تۆ دابەزی بێ و من بیخوێنم! فەرموی: قەینا بیخوێنە، حەز دەکەم لە دەمی کەسێکی دیکەوە بیبیستم. ئیبنومەسعودیش لە سەرەتای سورەتی نیسائەوە دەسپێدەکا تا دەگاتە ئەم ئایەتە:

---

(١) (المائدة - ٨٣).

(٢) (المائدة - ١١٨).

﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾[١]
پاشان فەرموی: (حسبك الان: ئەوەندە بەسە). ئیبنومەسعود تەماشای کرد بینی چاوەکانی فرمێسك هەڵدەڕێژن.
که گوێی له قورئان دەگرت ترسی خوای له دڵدا دەنیشت، شەوێکیان ئەبو موسای ئەشعەری قورئانی دەخوێندو پێغەمبەریش گوێی بۆ گرتبو، بۆ بەیانی پێی فەرمو:
لو رأيتني وأنا أستمع لقراءتك، لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود[٢]
خۆزگە دەتبینی که ئەمشەو چۆن گوێم بۆ هەڵخستبوی، بەڕاستی خوا نزمێکی له دەنگخۆشی خانەوادەی داودی پێداوی. ئەبوموساش دەڵێ: ئەگەر دەمزانی گوێت بۆ ڕادێراوم، چۆن خۆشترو بە جوانتر دەخوێندەوە[٣].
عەبدوڵلای کوری شوخەیر لە فەرمودەیەکی سەحیحدا دەگێڕێتەوەو دەڵێ: جارێکیان چومە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) نوێژی دەکرد، سینگی موبارەکی وەك مەنجەڵی کولاوی سەر ئاگر گیزە گیزی لا بەرز دەبوەوە.
ئەو وەختەی که ئامادەی ناشتنی زەینەبی کچی دەبێ، لەسەر لێواری گۆڕەکەی دادەنیشێ و لەبەر ترسناکی ئەم دیمەنەو یادکردنەوەی چارەنوس و تێفکرین لە ڕەوشی ناوگۆڕ، چاوەکانی فرمێسك دادەبارێنن، یاوەرانیش لەوێن و ئەم دیمەنە کاریگەرو پڕ لە ئامۆژگاریە دەبینن.
خۆشەویستمان لە گەلا لە فەرمودە شیرنەکانی باسی چاکەو گەورەیی گریان لە ترسی خوای کردوەو فەرمویەتی یەکێك لەو حەفت کەسەی لەبەر سێبەری بارەگای خوا رادەوەستن، ئەو کەسەیە کە ئەگەر لە تەنیاییدا یادی خوای کردەوە چاوەکانی فرمێسك ببارێنن...

---

(١) أخرجه البخاري (٤٥٨٢، ٥٠٥٥) ومسلم ٨٠٠ عن عبدالله بن مسعود.
(٢) أخرجه البخاري ٥٠٤٨ ومسلم ٧٩٣ عن أبي موسى.
(٣) هذه الزيادة أخرجها البيهقي في الكبرى (٤٤٨٤، ٢٠٨٤٢١) وفي الشعب ٢٦٠٤.

ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه

پیاوێکیش کە یادی خوا بکاتەوە چاوانی فرمێسك هەڵڕژن[1].

لە فەرمودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ:

عينان لا تمسّهما النار أبداً: عين بكت وجلاً من خشية الله، وعين باتت تحرس في سبيل الله [2]

دو چاو قەت ئاگریان بەرناکەوێ، چاوێك لەترسی خوا گریا بێ و چاوێکیش لەپێناوی خوا نەنوستبێ و لە دیدەوانیدا[3] بوبێ.

ئەو گریانە لەسەر ڕێگای سونەتی پێغەمبەرە کە لە ترسی خواو بەیادی ئەو ڕۆژە بێ کە دەگاتەوە لای پەروەردگارو لەبەردەستیدا بۆ لێپرسینەوە دەوەستێ، یا بەبۆنەی ئەوەبێ کە بیر لەئایەتە قورئانی و نیشانە گەردونیەکان بکاتەوە.

گریانیش لە سۆنگەی وەفاداری هەڵدەقوڵێ و یەکێکە لە بەهادارترین کردەوەی پیاوچاکان، بەتایبەتی لەو کاتانەی لە گوناهێك پەشیمانە یا تاعەتێکی لەدەست چوە، یا لەو کاتەی لەسزای خوا دەتۆقێ، یا کە بەزەیی بە لێقەوماوێکدا دێتەوە، یا کە لەناو ئامۆژگاریدا سۆزێکی ناسك دڵی داگیر دەکا، یا کە لەبیرکردنەوەدا ڕۆ دەچێ و ترس و هەیبەت هەناسەی سوار دەکەن.

گریان لە پێناوی دنیا کارێکی ناپەسندە، چونکە دنیایەکی فانی و بێبەها شایەن بەگریان و فرمێسك نیە.

گریانەکانی خۆشەویستمان بەسامترین و بەهادارترین گریانن و بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوای بە یەقینی ناسیوەو ترسێکی بێسنورو گەورەی لە خوا هەیە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە بەڕاستی ناسیویەتی و زانیاریەکی تەواوی لەبارەی چارەنوسەوە هەیە. بێگومان هەمو کردەو ئاکارەکانی پەیامبەرمان لەترۆپکی پلەو پایەی کردەواندایەو لە هەموشیان پیرۆزترە.

---

(١) بوخاری (٦٦٠،١٤٢٣،٦٨٠٦) و موسلیم (١٠٣١) لە ئەبو هورەیرەوە تەخریجیان کردوە.

(٢) أخرجه الترمذي ١٦٣٩ والبيهقي في الشعب ٧٩٦ عن ابن عباس

(٣) دیدەوان: ئێشك گرتن .

خۆشەویستمان لەوانە نەبو، کە بەهۆی لەدەستچونی شڕەوبڕەی دنیاو شڕوشیتاڵی بێبەها خەم و حەژمەت دەخۆن. لەو شادو فەرحان و لەخۆبایی و دڵرەقانەش نەبوە کە بەحاڵی ناگزوران[1] کاریگەر نابن و لە تەنگانان بێهەڵوێستن. بەڵکو بەپێچەوانەوە گریانەکانی لە ئەنجامی ئەو ئەفسوس و ئاخ و داخانە بوە کە لەپێناو ڕەزامەندی خوا هەڵیکیشاون. هەروەها پێکەنین و زەردەخەنەو شادبونەکانیشی هەر لەپێناو تاعەتی پەروەردگاری بوە. گشت سیفەتە نەجیمزادەکانی و هەمو ئاکارە چاکەکانی وێنەی هەرەبەرزی بەرچاوان و ڕوناکی ڕێبوارانی ڕێی چاکەخوازی بوە.

﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ﴾[2]

هەڵبەت پێغەمبەر سەرمەشقێکی چاکە بۆ ئێوە.

یارانی تەماشایان دەکرد وا لەسەر مینبەرێ چاوەکانی فرمێسکیان لێهەڵدەڕژێ و هەنسکی گریانی بەرز دەبێتەوەو نالە لە سینەی هەڵدەستێ و گیزەگیز لە دەنگی دەبیسترێ، ئەوانیش خۆیان بۆ ناگیرێ، یەککەڕەت ئەوانەی لە مزگەوتێدان دەدەنە قوڵپی گریان و فرمێسك دەبارێنن، گشتیان لە ئاست ئەو دیمەنەدا، کە بە ڕۆژگارو بە شەوگاران لەیاد ناچنەوە، سەر دادەنوێنن و بۆ چاوانیان لێدەگەڕێن تا بە فرمێسك حاڵی بێحاڵیان دەربڕن.

ئەی خودا! چ دیمەنێکی هەست بزوێنە کە موحەممەدی خۆشەویستت بەدیار خەڵکەوە، دڵۆپی فرمێسکەکانی، ڕومەتی موبارەکی تەڕکەن و بچۆڕێنەوە. ئەو محمدەی (صلی الله علیه و سلم) کە ئاشناترین کەسە بە ناسینی تۆ و زاناترین کەسە بە سروشی تۆ و ئاگادارترین کەسە بە چارەنوس!

فرمێسکەکانی لەو دڵەوە سەرچاوەی گرتوە کە لە ترسی خوا لێوان لێو بوە، لە دەرونێکەوە هەڵقوڵیوە کە خۆشەویستی خوا ئاوەدانی کردۆتەوە، ئەو دڵۆپە بێگەردانە چەند بەکاریگەرن، خەریکە لەگەڵ خەڵك دەدوێن، کە پتر لە ئامۆژگاری و وتاران تاوتەنسیری گەورەتر دەخەنە دلان .

---

(١) ناگزوری: دەستکورتی، نەداری .

(٢) (الاحزاب - ٢١).

# پێکەنینی
## پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)

پێکەنینی هێمنانە سارێژی روح و دەرمانی دەرون و هەسانەوەکیشە بۆ مێشکی ماندوی ناو ئیشوکاران. پێکەنین بە ڕێژەیەکی مامناوەندی بەڵگەیە لەسەر ئاسودەیی و مگێزی[1] دروست و ئاناڵۆز، نیشانەیەکیشە بۆ پاك و بێگەردی ناخ و دەرون.

خۆشەویست (صلی الله علیه و سلم) هەمیشە لەگەڵ خانەوادەکەی بەبزە بوەو پێکەنیوە، لەگەڵ ژنەکانی گاڵتەو گەپی کردوەو دڵی خۆش کردون و بە نەرم و نیانی و سۆزو خۆشەویستی ئاخاوتوە، چونکەوەك رەحمەتێك بۆ خەڵکی نێردراوە، شایەنترین کەسانیش بەم رەحمەتە خاوخێزان و کەس و نزیکان و دۆست و خۆشەویستانی خۆیەتی. لێوی موبارەکی هەمیشە زەردەخەنەی گەش و درەوشاوەی لەسەر پشکوتوە، کە بە پێکەنینەوە روبەروی خەڵك دەبوەوە دڵی یەخسیر دەکردن و سەرتاپای دەرونیان کەمەندکێش دەبو و روحیان دەکردە قوربانی. کە زەردەخەنەی دەهاتێ روخساری لەخۆریش درەوشاوەتر دەبو، نێوچەوانی لەمانگی چواردەش روناکتر بو، زەردەخەنەی لەپشکوتنی گوڵ جوانترو گەشاوەتر بو، گاڵتەی دەکرد بەڵام گاڵتەی ڕاست و دروست، گاڵتەکانی لەسەر روحی یارانی وەك ئاسکترین ئەو دڵۆپە ئاوانە بو کە دەچۆڕانە سەر جەرگی جەرگسوتاوان، لە دەستی ئەو باوکە بە سۆزەش نەرمتر بون، کە لە وەختی خواحافیزی سەفەردا بەسەر سەری کوڕەکەی دادەهێنێ. کە گاڵتەی لەگەڵ دەکردن ڕوحیان وە جۆش و خرۆش دەکەوت و سینەیان گوشاد دەبو و ڕەنگوڕویان دەگەشایەوە. سوێند

(١) مگێز: مزاج .

بەخوا یەك مەجلیسی ئەویان بە هەمو دنیا نەدەدا، یەك وشە لە وشە بەسۆزو دڵخۆشکەرو پڕشنگدارەکانی ئەویان بەسەد بارە زێڕو زیویش نەدەگۆڕیەوە.
جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلی دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه و سلم) هەر جارێکی منی دیبێ زەردەخەنەیەکی بۆ نواندومە. جەریر شانازی بەم نیعمەت و سەخاوەتە دەکا، ئەم زەردەخەنە گەرم و نەرم و ڕاستگۆیە لەنێو هەمو یادگاریەکانیدا جوانترین یادگاری و لەنێو هەمو ئاواتەکانیدا بەهادارترین ئاواتی بو، کە شانازی پێدەکرد.
هەرهێندە لە ڕوی یەکێ پێکەنیبا، ئیتر ڕوحەکەی لە چاکەو سۆزو بەخشندەیی سیخناخ و دڵەکەی لە لێبوردەیی و میهرەبانی و خۆشەویستی تەژی[1] دەبو، سەیرت پێنێ و وانەزانی پێکەنینەکانی شتێکی ئاسایی و هەڵوێستێکی هەوانتە بون، خۆزگە تۆش لەگەڵ ڕوداوەکاندا دەژیایت و لەگەڵ خەندەکانی بەشدار دەبوی، ئەو کات دەتزانی چ کاریگەرێکیان ناوەتەوە.
پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) کەسێکی ڕوخۆش و خوێن شیرین و سەنگین بو، وەك ئەوانە نەبو کە ڕوگرژ و ئێسکقوڕس و توڕەوتونلو مرومۆچن، یاوەك ئەوانەی لەڕاددەبەدەر پێدەکەنن و گاڵتەجارو نوکتەبازو چروك و پوکن، حاشا لە پێغەمبەر.. بەڵکو پێکەنین و گاڵتەو قسەخۆشەکانی سەنگینانەو بە جەوهەر بو، کە پێدەکەنی دەمی بەش نەدەکردەوەو بە قاقاش پێنەدەکەنی بەڵکو پێکەنینێکی نەرم و هێمن تا کارێژەی دیار دەکەوتن، هێندەشی درێژ نەدەکردەوە لەشی لەگەڵ بێتە هەژین یا لارو وێرو کوڕ بێتەوە.
ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) فەرمویەتی:

وإيّاك والضحك، فإن كثرة الضحك تميت القلب [2]

نەکەی هێندە پێبکەنی، پێکەنینی لەحەد بەدەر دڵ دەمرێنێ.
جارێکیان یەکێك لە یاوەرانی داوای لە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) کردو

---

(١) تەژی: پڕ .
(٢) أخرجه أحمد ٨٠٣٤ والترمذي ٢٣٠٥ وابن ماجه ٤٢١٧ عن أبي هريرة رضي الله عنه وانظر البيان والتعريف ٢٢\١ وكشف الخفاء ٨٥.:)

گوتی: حەز دەكەم سواری یەكێك لە وشترەكان بم، ئەویش ویستی گاڵتەی لەگەڵ بكات و فەرموی:

لا أجد لك إلاّ ولد النّاقه: (تەنها بەچكەی وشترەماچە هەیە).

پیاوەكە ڕۆیشت و پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بانگی كردەوەو فەرموی:

وهل تلد الإبل إلا النوق [١]: مەگەر وشتریلە لە وشتر نازێ؟

جارێكیان پیرەژنێك دێتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) و داوای لێدەكا لە خوا بپاڕێتەوە، تا بیباتە بەهەشتێ، ئەویش فەرموی:

لا يدخل الجنه عجوز: پیرەژن ناچنە بەهەشتێ!

نیتر ڕوی وەرگێڕاو بەگریانەوە گەڕایەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بانگی كردەوەو فەرموی:

ئەدی گوێت لێنەبوە كە خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً (٣٥) فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا (٣٦) عُرُبًا أَتْرَابًا ﴾ [٢] [٣]

ئێمە سەرلەنوێ شەنگ و شۆخیان دەكەینەوە. دەیانكەینەوە كچ. كچانێ كە هاوسەرەكەیان لەلا ئازیزەو هەمیشە لە تەمەنی لاوێتیدان.

پێكەنینەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ملكەچیی بون بۆ پەروەردگاری هەرەبەرز، هەموی مەبەستدار بون و وەك پێشەنگ و پێشڕەوێكی بێوێنە بون لەبۆ خەڵكی، بە بێهودەیی و گاڵتەجارو لەپێناو كات كوشتن و بەفیڕۆدانی زەمەن نەبو.

كە دەیویست سەفەرێك بكاو سواری ولاخەكەی دەبو، دوعای سەفەری دەخوێندو پاشان دەیفەرمو:

الّلهم اغفر لي ذنبي فإنّه لا يغفر الذّنوب إلاّ أنت:

---

(١) أخرجه أحمد ١٣٤٠٥ وأبو داود ٤٩٩٨ والترمذي ١٩٩١ عن أنس بن مالك.

(٢) (الواقعة: ٣٥-٣٧).

(٣) أخرجه الطبراني انظر مجمع الزوائد ١٠\٤١٩.

خوایه لەگوناهەکانم خۆش بەچونکە لەتۆ بترازێ کەس لەگوناهان نابورێ.
دوابەدوای ئەمە پێدەکەنی، یاران لێیدەپرسن: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەرچی پێکەنی؟ فەرموی:
يضحك ربك إذا قال العبد: اللهم اغفر لي ذنوبي فإنه لا يغفر الذّنوب إلاّ أنت، ويقول: علم عبدي أنه لا يغفر الذنوب إلاّ أنا [1]
ئەگەر بەندەیەك بڵێ: خوایە لەگوناهەکانم خۆش بەچونکە لەتۆ بترازێ کەس لەگوناهان نابورێ. خوا پێدەکەنێ و دەفەرموێ: بەندەکەم زانی کە جگە لە من کەس لە گوناهان خۆش نابێ.
هەروەها بەسەرهاتی ئەو کەسەشمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دواهەمین کەسە لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرەوەو دەچێتە بەهەشتێ، پاشان بەرە بەرە شتی زیاتر لەخوا دەخوازێ تا خوا (دە) هێندەی ئاواتەکانی پێبدا، خواش پێیدەبەخشێ، پیاوەکە دەڵێ: خوایە تۆ گاڵتەم پێدەکەی کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی! لێرەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) پێدەکەنی.
یەك لە ڕێنوێنیەکانی خوا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ئەوەبو کە لەکات و ساتی خۆیدا هەڵوێستی پڕبەپێستی وەردەگرت، لە وەختی خۆشی و شادیدا گاڵتەیەکی زۆر بەڕێوجێ و سەنگینانەو مامناوەندی دەنواند، لە وەختی ئامۆژگاری و ترس و یادەوەریشدا، گریان لە پێناو خواو سامگرتیبون و غەرقبون لە مات و بێدەنگیەکی بە کاریگەر حاڵ و ئاکاری بو. گاڵتەکانی ئاشنایی بە ڕوحان و ئارامی بە دڵان دەبەخشی، پێکەنینەکانی سارێژی دەرونان بو، تەنانەت گاڵتەو گەپە شیرنەکانی کە لە فەرمودەنامەکاندا نوسراون هەموی بە سوننەت حسێبن، هەر گاڵتەیەکی کە ڕاوییەکان ڕایانگواستۆتەوە بریتین لە ئاکارو ڕەوشتە پیرۆزو جوانەکانی.
پاکیی بۆ پەروەردگار! کە شانوشکۆی ئەو پەیامبەرەی هێند بەرزکردۆتەوە

---

(١) أخرجه أحمد ٩٣٢ وأبو داود ٢٦٠٢ والترمذي ٣٤٤٦ عن علي رضي الله عنه

تەنانەت پێکەنینەکانیشی لە هەناوی پەرتوکان پارێزراوە، وەك بڵێی سەیرو سەمەرەترین چیرۆکی پەندو ئامۆژگاری بن!

پاك و پیرۆزی بۆ خوا! کە پلەوپایەی ئەو پەیامبەرەی هێند بە بەرزی راگرتوە، تەنانەت ڕاویە جێباوەڕەکان پشت بەپشت بۆ یەکتریان گێراوەتەوە، وەك بڵێی فەرزێکی حەتمی جێبەجێ کەن!

هەزاران هەزار درودو سڵاوی خوا بەقەد ژمارەی هەناسەکانی سپێدەو راشکانی تاریکی شەوان، برژێ بەسەر محمد (صلی الله علیه و سلم) و یارو یاوەرانی.

# ستایشی
# پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)

خوای خاوەن بارەگای بالا بەڵێنی پێداوە پلەی هەرە ستایشکراوی پێ ببەخشێ، وەك دەفەرموێ:

﴿عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾[1]

بەشکو پەروەردگارت تۆ بنێرێتە پایەی ستایشکراو.

محمدی کوڕی عەبدوڵلا (صلى الله عليه و سلم). ئەو ناوە هەرە ناسراوەی هەرکە یادی بکرێ، بە جوانترین و نایابترین شێوە یادی چاکیەکان دەکرێ، لە بالاترین دیمەندا یادی پاکێتی دەکرێ، لە پیرۆزترین واتادا یادی دادگەری دەکرێ.
محمدی کوڕی عەبدوڵلا (صلى الله عليه و سلم). ناوێکە لەناو دڵی بڕواداراندا پیتەکانی بە ڕوناکی نوسراون، هەر دڵێك بنکۆڵ کەی لە بنوبۆتکە قوڵەکانیدا، لە ڕەگ و ریشاڵەکانیدا ئەم ناوەوەدی دەکەی.
موحەممەد خاوەنی قۆڵ و باسك و نێوچەوانی سپی و رۆشن، کە لە تەورات و لە ئینجیلدا باسی کراوەو بە جبریل پشتگیری کراوە.. هەڵگری ئاڵای شەرەف و شکۆ لە بەنی لوئەی، خاوەن پلەو پایەبەرزیی لە رچەی عەبدومەنافی کوڕی قوصەی.
پێغەمبەران موژدەی هاتنیان داوە، ناوی لەناو کتێبان بە هەزار ئاوازە دەنگی داوەتەوە، مێژو لە هەزاران جێ ناوی هەڵناوە، کۆڕو مەکۆ بەیادی ئەو پایەدارن، وتاری سەر سەکۆیان بە وتەی ئەو نەخشێنراون.

---

(١) (الإسراء - ٧٩).

خوا له گومرِایی و سەرشێواوی پاراستویەتی:

﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴾[١]

یارەکەتان نه گوم بوه، نه ڕێشی ون کردوه. له هەواو هەوەسی بەد پاراستویەتی.

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴾[٢]

بە ئارەزوی خۆی قسه ناکا.

قسەکانی شەریعەتن، واژەکانی ئاینن، داب و دەستورەکانی سروشن:

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾[٣]

هەرچی دەیڵێ سروشێکه لەخواوە پێیدەگا.

ئاخ پاك و سروشت چاك و ئاكار جوان و ڕەوشت مەردانەو هەڵوێست پیاوانەیە:

﴿ ...إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ﴾[٤]

بەڕاستی تۆ لەسەر هەقێکی ڕونی.

تەوازوعەکەی له تەواوی ژیانیدا ڕەنگی داوەتەوە، جوامێریەکەی سەرلەبەری هەڵوێستەکانی گرتۆتەوە، نورەکەی سەرتاپای ڕێگاکانی تەنیوەتەوە، کردەکانی مایەی ئاسودەیی خەڵکان بو، وتەکانی ڕاست و ڕەوان و بێ لەکه بون، هەڵسوکەوتی مەردانه بو.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾[٥]

بەراستی تۆ لەسەر خورەوشتێکی بەرزی.

---

(١) (النجم - ٢).
(٢) (النجم - ٣).
(٣) (النجم - ٤).
(٤) (النمل - ٧٩).
(٥) (القلم - ٤).

ڕەفتار نەرم و خوێن شیرن و ڕەزاسوك بو:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ... ﴾(١)

بەسای بەزەیی خوایە کە تۆ هێندە لەگەڵیان نەرمی، ئەگەر کەسێکی توندوتوڕەو دڵڕەق بای، بلاوەیان لێدەکردی.

لەژێر چاودیری و میهرەبانی خوا بو، ئالاکەی شەکاوە بو، بەختەوەرو سەرکەوتو بو، دەروازەکانی سەرکەوتنی لەبەردەمدا کرابونەوە:

﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴾(٢).

خوا دڵی چاك سازاندبو، ڕێگای لەبەردەمدا ڕوناك کردبوەوە، لە گوناهەکانی خۆش ببو:

﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾(٣)

تا خودا لە گوناهی پێشان و پاشانت خۆش بێ.

ئەو بو، ئەو چاکسازیکارەی کە خوا دلانی پێ ئاوەدان کردەوەو گەلانی پێ بەختەوەر کردو گەردنانی لە کۆتی کۆیلایەتی تاغوتان دەرباز کردو مرۆڤایەتی لە بتپەرستی رزگار کرد:

﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾(٤)

تۆ خەڵك بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنوێن دەکەی.

ئەو بو باری قورسی لەسەر شانی مرۆڤایەتی هێنا خوارێ و لە شەکەتیی هەساندیەوەو لە پەککەوتەیی دوری خستەوەو بە ئیزنی خوا کاروباری بۆ ئاسان کردن و ڕێوشوێنی ژیانی پێ ناساندن:

---

(١) (آل عمران - ١٥٩).
(٢) (الفتح - ١).
(٣) (الفتح - ٢).
(٤) (الشورى - ٥٢).

﴿...وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ...﴾[1]

ئەرکە قورسەکانیان لەسەرشانیان لادەدا، ئەو کۆت و زنجیریان لا دادەماڵێ.

ڕەحمەتە بۆ مرۆڤ . فێری عیبادەتی پەروەردگاری کردوە، نوری بڕوای لەدڵدا ڕشتوەو ڕێی بەهەشتی نیشان داوە.

ڕەحمەتە بۆ پیران. عیبادەتی بۆ ئاسان کردون، بەرەو ئاخیر خێری ڕێنوێنی کردون، واگای هێناون تا بەوەندە تەمەنەی کە ماویانە ڕابگەن و لە کاری چاکەی بەسەر ببەن.

ڕەحمەتە بۆ گەنجان. بەرەو جوانترین کردەوەو کاملترین ڕەوشتی لاوێتی ڕێنوێنی کردون، وزەو تواناکانی بەرەو نەجیمزادەترین و بەهادارترین خورەوشت ئاڕاستەکردون.

ڕەحمەتە بۆ منداڵان. لەگەڵ یەکەم فرچکیاندا[2] دینی فیترەتی پێ هەڵمژیون، لە یەکەم ساتی بونیدا بانگی یەکخواپەرستی گوێبیست کردون و لە منداڵیدا بەرگی بڕوای لەبەرکردون.

ڕەحمەتە بۆ ئافرەتان. لە تاریکترین ڕۆژگاردا دادگەرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردون، لە دنیای پڕ ستەمدا مافی پاراستون و لەنێو جەنگەڵی ژیندا پەنای داون، داوێن و ئایندەو ئابڕوی پاراستون، هەم باوکی ئافرەتان بوەو هەمیش هاوسەرو براو پەروەردەکار.

ڕەحمەتە بۆ فەرمانڕەواو کاربەدەستان. تەرازوی دادگەری داوەتە دەستیان، فەرمانی پێکردون لە ستەم و زۆرداری نزیك نەبنەوە، سنوری بۆ داناون تا نەتوانن مافی خەڵکی پێشێل بکەن، تێیگەیاندون کە چەندی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بن ئەوەندە بەڕێزن و بە حورمەتن.

ڕەحمەتە بۆ گەل. داکۆکی لێکردون و مافی ئازادی و ژیانی دادگەرانەی پێبەخشیون، نەیهێشتوە مافیان بخورێ، چجای تالان و بڕۆ و خوێنڕشتن و بێگاری و چەوساندنەوە.

---

(١) (الأعراف- ١٥٧).

(٢) فرچك: قومە شیری منداڵ لە مەمکی دایکی.

رەحمەتە بۆ سەرجەم خەڵكی، بەرەكەتە بۆ هەمو جیهان:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾[1]

ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد كە بەزەیی بیت بۆ هەمو خەڵكی دنیا .

كە پێدەكەنی، زەردەخەنە نەرمینەكەی، ڕەنگ و ڕوە گەشاوەكەی، دڵ و گیانی ئەودالّ دەكرد.

كە دەدوا، وتەكانی سنورەكانی دەرون و هەرێمەكانی ڕوحیان دەبڕی، وشەكانی لە ناخی دڵ هەڵدەنیشتن، واژەكانی لەسەر پەڕەی یادگەدا دەنەخشین و لە قولاییەكانی دڵ دەگیرسانەوە.

كە پێدەكەنی، شادی بەگۆڕێ وەردەبو، شوێنەكەی پڕ دەكرد لە دڵخۆشی و، شادی بەهاودەمانی دەبەخشی.

كە دەگریا. خەڵك ترسی خوایان لەدڵ دەنیشت، كانی چاوانیان بەخوڕ فرمێسكیان دەڕشت، دەرونیان خاڵی دەبوەوە، دەناورانەوە، دەپاڕانەوە، دەكڕوزانەوە، دەتگوت قیامەت لەراسانە، فریشتەی مەرگ هەلایسانە، ئەوی دەتدی هەر گریان و فرمێسك بو، ئەوی دەتبیست هەر كوڕژن و هەنیسك بو

﴿ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ۝٥٩ وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ﴾[2]

ئایا بەم وتانە سەرسوڕما دەبن، پێدەكەنن و ناگریێن.

كە وتاری دەدا، مینبەر دەهەژایەوە، ویژدان دەبوژایەوە، دڵ رادەچڵەكی، بیسەر گڕی تێبەر دەبو، دەحەپەساو شەیدا دەبو. تەنانەت ئەگەر بەرد چاوی هەبوایە دەگریا، ئەگەر دیوار دڵی هەبوایە ترس ئۆقرەی لێ هەڵدەگرت، ئەگەر رۆژگار گوێی هەبوایە مات و بێدەنگ دادەما.

كە دەجەنگا، وەك چیا دەچەسپی و وەكو لافاو بەرەو مەیدان هەڵیدەكرد، نەدەبەزی و خۆی رادەگرت.

---

(١) (الأنبياء - ١٠٧).

(٢) (النجم: ٥٩ - ٦٠).

﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ ﴾[(١)]

لەپێناو خوا بجەنگێ، تۆ هەر ئەرکی خۆت لەسەرە.

قەت بەخەیاڵ دانەدەهات جارێك لە جاران هەڵبێ یا چۆك دابدا و پشت لە دوژمن کا، شەڕ هەرچەندی گەرم بوایە ڕەنگوڕوی نەدەگۆڕاو نەدەشێوا، کوشتار چەندی گەرم بوایەو لاشەی بێ سەرو سەری بێ لاشە هەرچەندی کلاشەی کردبا، نەدەشلەژاو هێورو ئارام و ورە بەرز بو، شمشێر پیتەکانی مەرگی دەنوسیەوە، ئەو هەر ڕوگەش و دەم بەخەندە بو.

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ ... ﴾[(٢)]

محمد (صلى الله عليه و سلم) هەر پێغەمبەرێکە، سای ئەو پێغەمبەرانەی بەرلەوی هاتن و چون، ئەگەر بمرێ یا بکوژرێ، لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟! کە دەستی بەخشندەیی والا دەکرد، تا ئەوپەڕی سەخاوەتی دەنواندو کەس تۆزی ڕێگەی نەدەشکاند، چی هەبوایە دەیبەخشی، لە هەژاری پەروای نەبو، دنیای لەلا بێبەها بو، لە شرەوبرەی بێتەما بو، چاوی لە پاداشتی خوا بو. دەستەکانی وەك هەوری ئاسمان لەهەر کوێ بان بارانیان دادەباراند، ناولەپەکانی خێروبێریان هەڵدەپڕژاند، لەپێناو خوا گیان لەسەر دەست بو، لەپێناو شەکانەوەی ئالای لا الەالا اللە دا ڕوحی خۆی دەخستە ناو تیغی شمشێران، ئازایەتیەکەی نیشانەیەك بو بۆ بەخشندەیی، دەسپێشخەریەکانی بەڵگە بون بۆ بەرچاوتێری.

لە ساتەوەختێکدا هەرچی هەیبو دەیکردە خێرو خەلات، ماڵی دنیا بەبەرچاوی دانەدەهات، جاریوە سەدان وشتری یەکجێ بەخشیوە، ماڵی دنیا نرخی نەبو، دەسکەوتی فتوحاتی بەسەر موسڵمانان بەشیوەتەوە، فەرمویەتی:

والذي نفسي بيده، لو أن لي بعدد عضاة تهامة مالا لأنفقته ثم لا تجدوني

---

(١) (النساء - ٨٤).

(٢) (آل عمران - ١٤٤).

بخيلا ولا جبانا ولا كذابا [١]

قەسەم بەخوا ئەگەر بەقەد ژمارەی دڕك و داڵەكانی شاری مەككەش ماڵم هەبوایە، هەموم دەبەخشی، نە ڕژدیتان لا وەدی دەكردم نە ترسنۆكیش و نە درۆزنیش.

كراسی بەریان لا داوا كردوە لەبەری كردۆتەوەو بەخشیویەتی، زگی توند بەستۆتەوە تا بەرگەی برسێتی بگرێ . دەهندەیی حاتەم بۆ ناو و دەنگ و چاوڕا بو، بەڵام بەخشندەیی محمد (صلى الله عليه و سلم) لەپێنــاو ڕەزامەندی پەروەردگاری ئەرزو ئاسمان بو.

لە وەختی نەداریش ڕژدی نەنواندوە، لە وەختی هەژاریش هەر بەخشیویەتی، خۆی پێویست بوە بە خەڵكی داوە، خۆی ئاتاج بوە، بەڵام كە خەڵك ڕوی لێناوە بێهومێدی نەكردون.

ئەگەر لە تاوانبارێك خۆشبایە بە چاكە یەخسیری دەكرد، نە سەركۆنەی دەكردو نە داوای قەرەبوشی لێدەكردەوە. ئەگەر كەسێ خراپەیەكی لەگەڵ كردبا یا هەڵوێستێكی نەشیاوی بنواندبا، لە دڵی نەدەگرت و لە بیری دەچوەوە، گوناهی بە نەرمی لەناو دەبرد، خەتای بە لێبوردن دەتاراند.

﴿...فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴾ [٢]

بە شێوازێكی جوان چاوپۆشی بكەو ببورە.

نەتەوەكەی دژایەتی و ململانێیان لەگەڵ كردو ئەزیەتیان دا، جوێنیان پێدا، تانەو تەشەریان تێگرت، شاربەدەریان كرد، شەڕیان لەگەڵ بەرپاكردو بریندایان كرد، بەڵام كە سەركەوت و بالادەست بو، لێیان خۆش بو، لاپەڕێكی تازەی هەڵدایەوە، زایەڵەی دەستەواژە ناسراوەكەی كە فەرموی:

اذهبوا فأنتم الطلقاء [٣]

---

(١) مالك في الموطأ ٩٧٧.

(٢) (الحجر- ٨٥).

(٣) پێشتر تەخریج كراوە .

برۆن، ئێوە ئازادن. دەنگی دایەوەو لە هەناوی ڕۆژگاردا بە زندویی مایەوە.
سرودی خوڕەوشتی ئەوە بو کە دەیفەرمو:

إن الله أمرني أن أصل من قطعني، وأن أعفو عمن ظلمني، وأن أعطي من حرمني [١]

خوا فەرمانی پێکردوم سەردانی ئەوانە بکەم کە سەردانم ناکەن، لەوانە خۆش بم کە زوڵمیان لێکردوم، بەوانە ببەخشم کە دەستی یارمەتیان نەگرتوم.
سەرجەم ڕەوشتە جوانەکانی نێو قورئانی وەگێڕابوە نێو ژیانی، بۆیە عائیشە دەیگوت: ڕەوشتەکانی ئەو، قورئان بو.
کە بەڵێنی دەدا دەیهێنایە دی، دوژمنان پێشێلکردنی تاقە بەڵێنێکیشیان لەسەر تۆمار نەکردوە، نەیاندیوە پەیمانێکیش بشکێنێ، هەرچەندە ئەوان هەر چاوێکیان کردبوە چوار چاو تا یەك هەڵخزینی لا وەدی کەن، بەڵام مەحاڵە! ئەو لە هەمو ژیانیدا چ لە شەرو ئاشتیدا، چ لە تورەیی و ڕەزامەندیدا، چ لە کاروان و چ لە ماڵێ، هەر بە ڕاستگۆیی و دەسپاکی ژیانەکەی بردۆتە سەرێ. چۆن شتی وای لێدەوەشێتەوە!
جارێکیان پیاوێك وادەی پێدا لە شوێنێ ببینێ، پێغەمبەریش (صلی الله علیه و سلم) سێ ڕۆژان لەسەریەك، لەو جێگایە چاوەڕێی کرد، بۆئەوەی وادەکەی جێبەجێ بکا. لەگەڵ جولەکەو دیانان پەیمانی بەستوەو نەیشکاندوە، بەڵێنی پێداون بەجێی گەیاندوە، هەرچەندە ئەوان بە دڕندەترین شێواز دوژمنایەتیان کردوە. ئەو هەر دەبێ وابێ و لە بەڵێنان بەوەفا بێ و لە جێبەجێکردنی پەیمانان پێشەوا بێ، چونکە خۆی شەریعەتێکی بەوەفاو ڕاستگۆی هێناوەو لە هەڵوەشاندنەوەو شکاندنی بەڵێن و پەیمانان بە توندی وریایی داوەو بەحەرامی داناوە، ئەی ئەوە نیە کە فەرمویەتی:

آية المنافق ثلاث: إذا حدّث كذب، وإذاوعد أخلف، وإذا اؤتمن خان [٢]

---

(١) أخرجه رزين أنظر المشكاة ٥٣٥٨ وتفسير القرطبي ٣٤٦\٧ .
(٢) أخرجه البخاري (٣٣، ٢٦٨٢)، ومسلم ٥٩ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

نیشانەی دوڕوان سێ شتە: ئەگەر بدوێ درۆیان دەڵێ، بەڵێن بدا وەدوای دەخا، سپاردەی پێبسپێرن دەستی ناپاکی تێدەخا.

خواش پێی فەرمووە:

﴿...وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾[1]

پەیمان مەشکێنن، پەیمان لێپرسینەوەی هەیە.

﴿الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ﴾[2]

ئەوانەی کە پەیمانی خوا بەجێ دێنن و ئیتر هەڵیناوەشێننەوە.

---

(١) (الإسراء - ٣٤).

(٢) (الرعد - ٢٠).

# وتـارەكانی محمد (صلى الله عليه و سلم)

﴿...وَقُل لَّهُمْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا ﴾[1]

ئامۆژگاریان بدێ و قسەی وایان لەگەڵ بکە کار لە ناخی دەرونیان بکا.

فەرمو لە نامەی وتە پیرۆزەکانی بڕوانەو ڕوپەڕەکانی ڕەواننامەکەی هەڵدەوەو ڕامێنە. ئای کە چەند وتەی بەئابوتابن، چەند ڕۆح دەخەنە بەرکاریگەریی. لە دەربڕیندا پاراون، دەستەواژەکانی بەشەوقن، ڕوخسارەکانی ڕازاوەن، واژەکانی هەڵبژاردەن، ڕستەکانی ڕەسەن و تۆکمەن، وتەکانی دەڵێی مێرگی پڕ لە بۆن و بەرامن، دەڵێی باخچەی پڕ لە گوڵ و گوڵزارن، کە تازە تاوێك بارانی بەسەردا باریبێ و ئانێك سروەی بەسەردا هەڵکردبێ، وتەکانی موعجیزەی کورتبێژی و ڕەوانبێژین، لە فەرمودەیەکدا دەڵێ:

أوتيت جوامع الكلم [2]

سەرکۆی وتانم دراوەتێ.

واختصر لى الكلام اختصارا [3]

وتەکانم بۆ کورت کراوەتەوە.

ئەگەر لە فەرمودە واتەنیەکانی* کە نزیکەی (دە) هەزار فەرمودە دەبن، کە

(١) (النساء- ٦٣).

(٢) أخرجه البخاري ٢٩٧٧ ومسلم ٥٢٣ واللفظ له عن أبي هريرة.

(٣) أخرجه البيهقي في الشعب ١٤٣٦ عن عمر رضي الله عنه وانظر كشف الخفاء ١\١٤-١٥.

* الاحاديث القولية

باسوخواسی دنیاو دوایی و سەربردەکانی ڕابردو و پەرجوەکانی[١] داهاتوی گرتۆتەوە، ڕامێنی و بتەوێ لە کاریگەرو پایەبەرزی و پەندو پوختەو پاراوی وتەکانی بفامی، فەرمو لەگەڵ وتەکانی رەوانێژترین و زمان پاراوترین مرۆڤ بەراوردیان پێبکە، ئەودەم بۆت دەردەکەوێ کە لەبەردەم چ وتەیەکی ناوازەو بێوێنەدا داماوی. کە دەچیە هۆڵێك سەیری ئەو تابلۆیانە دەکەی، کە وتە نەمرو قسە نەستەقەکانی وتاربێژ و شاعیرە بەنێوبانگەکان و پیاوە هەڵکەوتوەکانی دنیایان تێدا ڕانوێنراوە[٢]، سەرسام و کاریگەر دەبی، بەڵام ئەمجارە کە سەیری وتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەکەی هەمو وتەکان لەبەر چاوتا ون دەبن و هێند کاریگەرو سەرسام دەبی، وەك بڵێی پێشتر بە هیچ وتەیەك سەرسام نەبویی! تەنانەت ئەوانەی ڕەشۆکین و جۆرەکانی قسانیش لە یەکتری جوێ ناکەنەوە بە شێوەیەکی تایبەتی بە وتەکانی پێغەمبەر کارتێکراو دەبن و نابوتابێکی[٣] تایبەتی لاوەردەگرن.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەیەوێ ئامۆژگاریەکی ئەوتۆی موعازی کوری جەبەل بکا، کە سەری هەمو ئامۆژگاریان و دەرمانی حەفت دەردان بێ، چەند دەستەواژەیەکی کورت و پوخت و پڕ لە سودو گەوهەرئاساو دڵرفێن و ئامێز ڕەوشەنی پێدەفەرموێ:

**اتَّقِ اللهَ حيثما كنت، وأتبِعِ السيِّئة الحسنةَ تمحُها، وخالِقِ الناسَ بخلقٍ حَسنٍ[٤]**

لەهەر کوێ بوی لەخوا بترسێ، لەپاشی گوناح چاکە بکە، ڕەشیدەکاتەوە، لەگەڵ خەڵکیش بەچاکی هەڵسوکەوت بکە. هەر ڕەوانبێژێکی دی ئەگەر بیویستایە هەمان ئامۆژگاری دەربڕێ، بێگومان زۆری دەڕست و دوورودرێژی دەکردەوە، یا مانای دەکردە قوربانی وشەکان، یا وشەکانی دەکردە قوربانی مانا.

جارێکیان عوقبەی کوڕی عامر خوا لێی رازی بێ، لێی دەپرسێ (دەربازبون)[٥]

---

(١) پەرجو: معجزة .

(٢) ڕانواندن: خستنەڕوو، عرض.

(٣) ناب و تاب: تام و چێژ .

(٤) أخرجه أحمد (٢٠٨٤٧، ٢٠٨٩٤) والترمذي ١٩٨٧ والدارمي ٢٧٩١ والمشكاة ٥٠٨٣.

(٥) دەربازبون: نجاة.

چیه؟ ئەویش بێئەوی زمانی تەتەلەبکا یا دامێنێ، دەسبەجێ ڕستەیەکی ڕاست و ڕەوان و فامیدەو سروش ئاسای لە زاری پیرۆزی دەپشکوێ و دەفەرموێ:
كفّ عليك لسانك، وليسعك بيتك، وابك على خطيئتك [1]
زمانت بگرەو با ماڵەکەت بتگرێتە خۆ و بۆ گوناهەکانت بگریێ.
جوان تەماشای ئەو دابەشکاریە سییانیە جوانە بکە، چەند پڕ لە ماناو کورتبڕن، ئاشکرایە کە پێشتریش وەڵامەکەی گەلاڵە نەکردوە، چونکە پرسیارکەر لە هێکڕا پرسیار دەکاو ڕاوەستاوەو چاوەڕوانی وەڵام دەکا، بەپەلەیەو ئامۆژگاری گەرەکە.
جارێکی تر لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا بە سواری کەرێ بە ڕێگادا دەڕۆن و هەر لەرێوە ئامۆژگاریەکی هێند کاریگەرو ڕەوانبێژانەی دەکا کە دڵ ببێتە یەخسیری و هەرکەس بیبینێ ئۆقرە نەگرێ و بێ بەرەوپیری. فەرموی:
يا غلام! إني أعلمك كلمات: احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، تعرّف على الله في الرخاء يعرفك في الشدة، وإذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو اجتمعوا على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، ولو اجتمعوا ان يضروك لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رفعت الأقلام وجفّت الصحف. واعلم أن النصر مع الصبر، وأن الفرج مع الكرب، وأن مع العسر يسرا [2]
لاوە! با چەند وتەیەکت فێرکەم: خوا بپارێزە دەتپارێزێ، خوا بپارێزە دەگاتە فریات، لە خۆشیدا خوا بناسە، لە تەنگانەدا دەتناسێ، ئەگەر شتێکت خواست لە خوا بیخوازە، ئەگەر پشتت بەست بە خوای ببەستە، بزانە ئەگەر سەرجەم نەتەوان کۆ ببنەوە تا سودێکت پێ بگەینن، نایگەیەنن مەگەر ئەوەی خوا بۆی نوسیوی، ئەگەر دیسان کۆببنەوە تا زیانێکت پێ بگەینن، نایگەیەنن مەگەر

---

(١) أخرجه أحمد ٢١٧٣٢ والترمذي ٢٤٠٦ وابن أبي عاصم في الزهد ١٥١١ وصححه عن عقبة بن عامر رضي الله عنه ل ١١٥.
(٢) أخرجه أحمد (٢٦٦٤، ٢٧٥٨، ٢٨٠٠) والترمذي ٢٥١٦، والحاكم ٦٣٠٤ عن ابن عباس رضي الله عنهما وانظر المشكاة ٥٣٠٢.

ئەوەی خوا بۆی نوسیوی. قەڵەمەکان هەڵگیراون و پەڕەکان وشك بونەتەوە، بزانە کە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتنە، دەربازبون لەگەڵ تەنگانانەدایە، سانایی لەگەڵ ئاستەنگاندایە.

ئێستا فەرمو چاو ببڕە ئەو دەقە ئاست بەرزەی ڕەوانبێژی و عەقڵ بکە بە دادوەرت، ئایا هیچ وتەیەکی مرۆڤانت وەك ئەم وتەیە بینیوە؟ بڕگەکانی چەند بەپێزن، واژەکانی چەند بەچێژن، ماناکانی چەند بەهێزن!. فەرمودەی (احفظ الله يحفظك: خوا بپارێزە دەتپارێزێ) لەو ڕستە دانستانەیە[1] کە لەیادگەی بەیانبێژیدا هەڵکۆڵدراوە، کە عەقڵی ساغ لە دیوەخانی ڕەوانبێژیدا دەست لەسەر سینە ڕادەوەستێ و سەر دادەخا. ئەم ڕاسپاردەیە گشت ڕاسپاردەکانی لەئامێز گرتوە، گشت ئامۆژگاریەکانی لەم ئامۆژە کۆکردۆتەوە.

ئەگەر کەسێکی تر هەمان ئامۆژی دەربڕیبوایە دەیگوت: خوا بپارێزە بەوەی ئەمرەکانی جێبەجێ کەی، بەهۆی نیعمەتەکانی دەتپارێزێ. خوا بپارێزە بەوەی لەنەهیەکانی دورکەویەوە، لە سزاکانی دەتپارێزێ. لەگەنجێتیدا خوا بپارێزە، لە پیریدا دەتپارێزێ. ئیتر بڕۆ دوێ و لیستێکی درێژ لەوشە دژماناکان و (ئەگەروا بکەی- وا دەبێ)ی بۆ ڕیز کە. بەڵام ئەو فەرمویی: (خوا بپارێزە دەتپارێزێ)، هیچ دەستەواژەیەك نیە وەك ئەم قسە جوان و گەش و روناکە، داهێنەرو دڵڕفێن و کورت و پوخت و پڕ مانا بێ.

جا ئەگەر یەکێکی لەو کەسانەی چێژ لە ڕەوانبێژی وەردەگری و بە ئەفسونی وتاران سڕ دەبی، ڕست بەڕستی فەرمودەکە بخوێنەوەو لەواژەو واتاکانی رامێنە. هەرکام لە فەرمودە گولاوڕێژ و پاکەکانی وەرگری، نە لەقی و لەنگی و نە قەڵسی و قورسی تێداوەدی ناکەی! هەموی هەر ئاسك و شکۆدارن، هەر ئاسانی تیشکدارن، هەر ڕەسەن و واتادارن. پاکی بۆ ئەو خوایەی کە قسەی بە ئابوتاب و ڕەوان و پاراوی لەسەر زاری پشکواندوە.

لە فەرمودەیەکی تریدا دەفەرموێ:

---

(١) دانستە: دانسقە، نایاب .

إنَّما الأعمالُ بالنِّيّات [١]
کارەکان بەگوێرەی نیازن.
ئەم دو رستە جوان و گشتیە، تەواوی مەوداکانی ئەحکام و ئاقیدەو ئاداب و ئەخلاقی لە دو توێی خۆدا کۆکردۆتەوەو باڵی بەسەر هەمو ماناکاندا کشاندوەو تەواوی مەبەستەکانی دەربڕیوەو مانایەکی پڕ بەپێستی گەیاندوە.
نمونەیەکی تر لەو فەرمودانەی کە لەناکاو و بەخۆڕسکی فەرمویەتی ئەوەیە کە جارێکیان منداڵێکی ئەنساری، چۆلەکەیەکی هەبو و یاری پێدەکردو مردبو، دێتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)، ئەویش پێی دەفەرموێ:
يا أبا عُمير ما فعل النُّغَير [٢]
عومەرۆکە کوا جوجۆکە، چی لێهاتوە؟ تەماشای ئەم دو رستە هاوکێش و سەرواداره جوان و هاوسەنگە بکە، کە نە درزی تێدایە نە زێدەرۆیی.
لە جەنگی حونەیندا لەناو ئەو مشاوەشیەدا هاواری دەکردو دەفەرمو:

أنــا النــبـيُّ لا كــذب　　　　أنــا ابنُ عبدالمطـــــلّب [٣]

*درۆ نیە، پێغەمبەرم　　　　کوڕی عەبدولمەتەللیبم*

خۆ ئەگەر زانایانی زمان و پیتۆلانی ڕەوانبێژی بیانەوێ بەهەڵەداوان وتەیەکی ئاوا بوێژن ناتوانن و بۆیان نایێ.
سەیر نیە ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) زمان تەرو پاراوترین کەس بێ، چونکە پەرجوی هەرە گەورەو نیشانەی هەرە مەزنی ئەو، قورئانە، کە تەواوی قسەزان و شاعیران و عەرەبی عەرەبی زانان لە ئاستیدا دۆشداماون. کەواتە دەبێ پێغەمبەری خاوەن ئەم سروشە لەئاستێکی ئاوا بەرزی ڕەوانبێژیی کەمەندکێش و نایابی ئەوتۆ دابێ، دلان سەرسام و شەیداکا.

---

(١) أخرجه البخاري (١،٥٤) ومسلم ١٩٠٧ عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه.
(٢) أخرجه البخاري (٦١٢٩، ٦٢٠٣)، ومسلم ٢١٥٠ عن أنس بن مالك رضي الله عنه.
(٣) أخرجه البخاري (٢٦٤، ٢٨٧٤)، ومسلم ١٧٧٦ عن البراء بن عازب رضي الله عنه.

# فەتواکانی محمد (صلی الله علیه و سلم)

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ ﴾[١]

له مەسەلەکانی ژنان لێتدەپرسن، پێیان بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) له زانستی فەتوادا لەلایەن خواوە پاڵپشتی لێکراوە، خوا دەرگاکانی زانستی بۆ ئاوەلا کردوەو کلیلی گەنجینەکانی تێگەیشتنی داوەتە دەست، وەڵامی هەر کەسێکی بەگوێرەی حاڵی ئەو کەسە داوەتەوە، تا هەم لە دنیادا چاك بسازێ و هەم لە ئاخیرەتیش سودوەرگرێ، وەڵامێکی پڕ بەپێستی بە بالای پرسیاراندا هەڵبڕیوە، بە جوانترین و ڕێك و ڕەوانترین شێواز دەریبڕیوە، بابای بیسەر چەشەی[٢] لە وتەکان هەڵمژیوە، دەتگوت بەرلەوەی خاوەن پرسیاری دیبێ و بەرلەوەی فەتوای بۆ بدا، ژیانی ئەوکەسەی خوێندۆتەوەو بە پێچ و پەناو چۆنیەتی بیروبۆچونەکانی ئاشنا بوە، هەڵبەت هەمو ئەمانە بەتینی تاوی پەیامبەرێتی و بەسای بەرەکەتی سروش و بە یارمەتی و پاڵپشتی پەروەردگارەوە دەهاتنە دی.

پیاوێکی پیری پشت چەماوە دێتە لای و لەبارەی کردەوەیەك لێی دەپرسێ، کە تا ماوە بتوانێ لەسەری بەردەوام بێ، ئەویش کردەوەیەکی بۆ دەسنیشان دەکا کە لەگەڵ حاڵە لاوازەکەی بگونجێت و لەهەمان کاتیشدا چاکترین کردەوەو ئاسانترین عیبادەت و ساناترین گوێڕایەڵی بێ. بەدو - سێ وشەی پوخت و

---

(١) (النساء - ١٢٧).

(٢) چەشە: تام، چێژ .

پروەڵامی دەداتەوە، کە ڕەنگە لە یەکێکی تری پرسیبوایە، بێنەوەی بێتاقەتی و پیرییەکەی لەبەرچاو بگرێ، پێیدەگوت: مادەم خۆری تەمەنت روی لە ئاوابونە، بۆیە تاماوی هەڵیقۆزەوەو تا دەتوانی لە خواپەرستی خۆت ماندو کە.
فەرمو تەماشای ئەو چەندوشە جوانانە بکە:

لا يزال لسانك رطبا من ذكر الله [1]

با هەمیشە زمانت بەیادی خوا تەڕ بێ. بڕوانە چەند بە جوانی وێنای کردوەو چەند بە شیرنی و بە لێزانی مەبەستەکەی گەیاندوە، دەستەواژەیەکی ئەوتۆیە، کە بیسەر بەشەوقەوە بەرەو کردەوەکە هەنگاو هەڵگرێ.
غەیلانی سەقەفی- کە پیاوێکی زەبەللاح و بەهێزو بەتوانا دەبێ، دێتە لای و داوای لێدەکا، کردەوەیەکی پێ نیشان دا لە خوای وەنزیك خاتەوە، ئەویش دەفەرموی:

عليك بالجهاد في سبيل الله

جیهاد بکە لەپێناو خوا.
بڕوانە چ کردەوەیەکی شایەن بەحاڵ و تین و توانای بۆ ئەو کەسە دەسنیشان کردوە، بەڕاستی ئەوپەڕی دانایی و زیرەکی نیشان دەدا.
ئەبوزەڕ کە پیاوێکی توڕەو توند دەبێ دێتە لای و داوای ئامۆژگاری لێدەکات، ئەویش سێ جاران پێی دەفەرموێ:

لا تغضب توڕە مەبە" ثلاثا.[2]

بێگومان ئەمە دەرمان و چارەی دەردی ئەوە. دەرمانێك کە لە دەرمانخانەی پێغەمبەرایەتی نەبێ نابەخشرێ، کە دواتر ئەم وشەیە بوە بنەڕەتێك لە بنەڕەتەکانی ئاین و شەریعەت.
جارێکیان پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) چاوی بەئەبوموسای ئەشعەری

---

(١) أخرجه أحمد (١٧٢٢٧، ١٧٢٤٥) والترمذي ٣٣٧٥ وابن ماجه ٣٧٩٣ وانظر المشكاة ٢٢٧٩.

(٢) أخرجه البخاري ٦١١٦ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

دەكەوێ بەسەر شاخێ هەڵدەگەڕێ، پێی دەفەرموێ:

عليكَ بِلا حول ولا قوة إلا بالله، فإنّها كنزٌ من كنوز الجنة [١]

بڵێ: هیچ هەوڵ و هێزێ نكارێ، مەگەر بەسای پەروەردگارێ، ئەم وتەیە گەنجینەیەكە لە گەنجینەكانی بەهەشتێ.

ئەم وتەیە دەگەڵ بەسەر شاخ هەڵگەڕان و هەڵگرتنی كۆڵ و باران دەگونجێ، چونكە ئەوە دەسەلمێنێ كە بەندە چ هەوڵ و هێزێكی لەدەست نایە، ئەگەر كۆمەكی خوای لەگەڵدا نەبێ، ئای كە ئەم ئامۆژگاریە چەند لەجێگای خۆیەتی و چەند شایەن بەو شوێنەیە.

هەروەها لەبەرئەوەی كە دەبینێ ئەبوزەڕ لاوازیەكی تێدایەو كەم بەرگەی دژواری دەگرێ، فەرمانی پێدەكا خۆی لە بەرپرسێتی بەدور بگرێ، چونكە بەرپرسێتی هەم راسپاردەیەكە لەگەردنی ئادەمیزادو هەمیش ڕیسوا بون و پەژیوانیی ڕۆژی ڕابونی لەدوایە، ئەگەر شایەن بە ئەرك و داخوازیەكانی هەڵسوكەوتی لەگەڵدا نەكرێ، وێڕای ئەمە گەلا دەرگای تری خێروخێرات لەبەردەم كەسانی وەكو ئەبوزەروالایە. جا بڕوانە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) خاوەنی چ زیرەكی و شارەزاییەكە بەتواناو بەهرەكانی خەڵكی

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾[٢]

هەرچی دەیڵێ سروشێكە لەخواوە پێیدەگا.

موعاز دەنێرێتە یەمەن و پێی دەڵێ:

إنك تأتي أقواماً أهلَ كتابٍ [٣]

تۆ دەچیە لای گەلانێكی خاوەن كتێب.

تا موعاز بەئاستی ئەو خەڵكانەی دەیاندوێنێ شارەزا بێ و حاڵەتەكەیان لەبەرچاو بگرێ و بەجۆرێكی وا بیاندوێنێ لەگەڵ ڕەوشەكەیان بگونجێ.

---

(١) أخرجه البخاري (٤٢٠٥، ٦٦١٠) ومسلم ٢٧٠٤ .

(٢) (النجم - ٤).

(٣) أخرجه البخاري (١٤٥٨، ١٤٩٦) ومسلم ١٩ عن ابن عباس رضي الله عنهما.

جارێکی دیکه لەگەڵ موعازا بەسواری کەرێ دەبن، ئامۆژگاری دەکات کە مافەکانی خوا لەسەر بەندەکانی و مافی بەندەکانیش لەسەر خوا چین.
ئەم جۆرە ئامۆژگاریە شایەن بەکەسێکی زاناو بانگبەری وەکو موعاز زۆر لە جێگای خۆیەتی، چونکە ئەویش لەلای خۆیەوە هەمان ئامۆژگاری بەخەڵکان رادەگەیەنێ و بەم پێودانە ئاراستەو ئامۆژگاری و رێبەرایەتی خەڵك دەکات.
خۆ ئەگەر بیاباننشینێ بوایە ئەم جۆرە قسەیەی بۆ نەدەگونجا.
جارێکیان حوصەینی کوڕی عوبەید دێتە لای و ئەویش لێی دەپرسێ:
" کم تعبد: چەند خوا دەپەرستی؟" دەڵێ: حەوت، یەکیان لە ئاسمانەو شەشیش لە ئەرزی.
دەفەرموێ:
من لرغبك ورهبك: کامیان لەپێناو ترس و تەماتن؟
دەڵێ: ئەوی لە ئاسمانە.
دەفەرموێ:
فاترك التي في الأرض واعبد الذي في السماء
کەواتە واز لەوانەی ئەرزی بێنەو ئەوی لەئاسمانە بیپەرستە.
پاشان فەرموی:
قل اللهم ألهمني رشدي وأعذني من شرّ نفسي [1]
بڵێ: خوایە ڕاستەڕێم بکەی و لە بەدیی دەرون پەنام بدەی.
ئەم دوعایە لەگەڵ حاڵی حوصەین دەگونجێ، چونکە ئەو لە حاڵەتێکی گومان و دودڵی و دوری لەرێی راست دەژیا، بۆیە ئەوەی بۆ دەشیا کە راستەڕێبون و خۆپەنادان لەبەدیی دەرون، لەخوا بخوازێ، چونکە هەمو بەلایەك لەدەرونەوە سەرچاوە دەگرێ.
هەروەها بەوە ئامۆژگاری عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کرد کە بڵێ:

---

(١) اخرجه الترمذي ٣٤٨٣ واللالكائي في شرح اعتقاد أهل السنة ١١٨٤ عن عمران بن حصين رضي الله عنه وانظر المشكاة٢٤٧٦

اللّهم اهدني وسدّدني [1]

خوایە هیدایەتم بدەی بمخەیە سەر ڕاستەڕێ.

ئەمە لەگەڵ حاڵی عەلی دەگونجێ، چونکە ئەو تا سەردەمی دوبەرەکی و پەیدابونی فیتنە ژیا، بێگومان ڕەوشێکی ئاوا تاریك و پڕ کارەسات و پڕ لەهەراوهەنگامەی هەوەست و رای جۆراوجۆرو دژ بەیەکدا ئەوە دەخوازێ کە داوای هیدایەت و داوای ڕاستەڕێبون لە خوای هەرە زیندوی ڕاگر بکرێ.

پاکی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە رازی دلانی بۆ پێغەمبەرەکەی ئاشکرا کردوە، پەردەی لەسەر فامە پەنهانەکانی بۆ هەڵداوەتەوەو دنیایەك لەتێگەیشتنی پێبەخشیوە. تێگەیشتنێك کە لەوەسف و سەنا نایەت.

قسەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) قسەی ئەو شاعیرانە نیە کە مل لە تاریکی دەنێن و پەل بە هەمو لایان هەڵدەکوتن و خەیالەبزڕکاو و تێڕوانینە بەهالاوەکانیان شتی ئەنتیکەو عەجیبیان بۆ دەنەخشێنن. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەلایەن خواوە پارێزراوەو لەو هاتەران و پاتەرانەی [2] ئەوان دەیلێن وەدورە، قسەکانی ئەو سروشن بۆی دەهاتن، شەرع بون دەخوێنرانەوە. قسەکانی قسەی سیاسەتمەداران نەبو بۆ ڕەزامەندی خەڵکان و خەڵەتاندنی جەماوەرو ساغکردنەوەی کالاکان بەکار بێن، بەڵکو ئەو پێغەمبەرێکی خودایی بێخەتا بو، لەرێی جبریلەوە دینی راست و دانایی بەرێوجێ و ڕێبازی پڕهیدایەتی بۆ دەهات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ئەدیبێك نەبو لە هەگبەی رۆشنبیریی خۆی هەڵگۆزێ و لە زانیاریەکانی یادگەی هەڵڕێژێ، سای ئەو ئەدیبانەی کە لەبەرهەمی خەڵکان و لە کلتوری مەردومانی قورزادو نەژادخۆڵەوە، ڕۆشنبیریەکی پێکهێناوە، بەڵکو ئەو مامۆستایەکی پایەبەرزو لەسەرچیخچون و وێڵبون و سەرگەردانی پارێزراو بو.

---

(١) اخرجه مسلم ٢٧٢٥ عن علي رضي الله عنه.

(٢) هاتەران و پاتەران: شرم و برمی شێواوان، وڕێنە .

# پاکیی محمد (صلی الله علیه و سلم)

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾[1].

خوا تەواوی بەهرە چاك و جوانەکانی بەپێغەمبەرەکەی بەخشیوەو بەتایبەت چاودێری لێکردوە، تائەوەی بۆتە سەرمەشقی چاکەکاری، ئەو سەرچاوەی فێربونی رێزو رێزکارییە، کانگەی پلەو پایەدارییە. هەڵبەت مەرجە ئەو کەسی سەرمەشقی کەسان بێ، خاوەن بەرزترین ڕەوشت و ئاکاری جوان بێ، پەیامبەریش ئەوکەسەیە کە لەلایەن پەروەردگاری هەڵبژێردراوە، تا خەڵك بەرەو جوانترین ڕەوشت و مەردانەترین هەڵوێست و پایەدارترین رێباز راپێش کا.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ئەو پاك و پیرۆزەیە، کە دڵی بەئاوی ژیان شوراوەتەوەو وەك بەفر سپی و خاوێن بۆتەوە، هەرچی رق و کینەو ئیرەیی و گزی و غەرەزە خوا لە سینەی دەرکێشاوە، لەسەرجەم خەڵکی بە بەزەییترو چاکەوەرترو ڕێزەوانترە، ڕێزو حورمەت و نەرم و نیانی و بەخشندەیی بەتەواوی گوندو شارو دورو نزیکان ڕاگەیشترە، دەرونی لە گشت دەرونان سافترە، سینەی لە سەرجەم سینان فرەوانترە، ویژدانی لە هەمو ویژدانان خاوێنترە. بێگومان ئەو شایستەیە خاوەنی ئەو هەمو پاکییە بێ، چونکە بۆ سەرکردایەتی جیهان و چاکسازاندنی بونەوەران و ڕاستەرێکردنی مرۆڤایەتی هەڵبژێردراوە.

---

(١) (الأحزاب: ٤٥ - ٤٦).

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾[١]
ئێمه هەر بۆیه تۆمان نارد که بەزەیی بیت بۆ هەمو خەڵکی دنیا .
خەڵکی هاندەدا توڕە نەبن و دەیفەرمو:
لا تغضب: توڕە مەبە.
خۆشی له هەمو پاڵنەرو هۆیەکانی هەڵچون و توڕەیی بەدور دەگرت. بگرە باڵی نەرم و هێمنی بەسەر تەواوی خەڵکاندا ڕادەهێلا، ڕێزو حورمەتی بۆ دەنواندن و دەرگای لێبوردەیی لەگشت کەسێ دەکردەوە. دەیفەرمو:
لا تحاسدوا [٢]: ئیرەیی بەیەکتر مەبەن.
خۆشی لەو دەردە کوشندەیە دەپاراست، تەنانەت تاقە گەردێکی ئیرەیی و دڵۆپێك کینەشی لەناخیدا نەبو، خوا لەو سیفەتە بەدە پاراستبوی، بگرە مایەی بەشکردنی خێرو بێرو چاکیەکانی خوا بو بەسەر خەڵکی. دەیفەرمو:
ولا تدابروا، ولا تقاطعوا
پشت لەیەکتر هەڵمەکەن و پەیوەندی لەگەڵ یەکتری مەبڕن.
خۆشی لەئاستی وتەکانیدا بو، پەرەی بەپەیوەندی خزمایەتی و چاکەو چاکەخوازی دەدا، سەردانی ئەوانەی دەکرد که سەردانیان نەدەکرد، ئەوانەی زوڵمێکیان دەرهەقی دەکرد لێیدەبورین، ئەوانەی پێیان نەدەبەخشی پێیدەبەخشین.
موحەممەد (صلى الله عليه و سلم) مەزنترین بەندەی خوا بو که ئەم ئایەتەی لا وەدیهاتبێ:
﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾[٣]
ئەوانەی رکی خۆیان دەخۆنەوەو له خەڵك دەبورن.

---

(١) (الأنبياء - ١٠٧).
(٢) أخرجه البخاري (٦١١٦، ٦٠٧٦)، ومسلم ٢٥٥٩ عن أنس بن مالك رضي الله عنه هامش ١٢٧
(٣) (آل عمران - ١٣٤).

دەیفەرمو:

إن الله أوحى إليّ أن تواضعوا [١]

خوا سروشی بۆ هەناردوم کە بێفیز بن.

تەواوی ماناکانی خاکیبون لە ژیانیدا لە شێوەی زندوترین دیمەندا رەنگی دابوەوە. سواری کەرێ دەبو، کەوشەکانی جوت دەکرد، لەسەر خۆڵێ دادەنیشت، بەدەستی خۆی مەڕی دەدۆشی، لەگەڵ پیران ڕادەوەستا، گوێی لەحاڵ و سکالای کەنیزان ڕادەگرت، میوانداری سەحرانشینانی دەکرد، دەچوە کۆڕی هەژاران و لەگەڵیان تێکەڵ دەبو. دەیفەرمو:

خيركم خيركم لأهله وأنا خيركم لأهلي [٢]

چاکترینتان ئەوکەسەیە بۆ خاوخێزانی چاکترین کەس بێ، منیش بۆ خاوخێزانی خۆم لە هەموتان چاکترم.

ئەم فەرمودەیە بە جوانترین شێوە لەژیانی خۆیدا رەنگی داوەتەوە، لەمەڕ خاوخێزانەکەیدا میهرەبان و بەسۆزو بەزەیی بو، کە دەهاتەوەماڵێ بەبزەو پێکەنینەوە روی تێدەکردن، ناسکترین گاڵتەو خۆشترین رەفتاری لەگەڵدا دەکردن، لەخزمەتکردنەکانی ماڵەوە یارمەتی دەدان، بەشیرنترین وشە سەرنجیانی ڕادەکێشاو جوانترین گفتوگۆی شەوانەی لەگەڵدا دەگۆڕینەوە، دور لە هەمو رەقی و توندوتیژی و سەرکۆنەیەك رەفتاری لەگەڵیان دەکردن.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ [٣]

بەڕاستی تۆ لەسەر خورەوشتێکی بەرزی.

جارێکیان کە غەنیمەتی دابەش دەکرد پیاوێك پێی گوت: بەدادگەری دابەشی کە ئەی محمد (صلى الله عليه و سلم).

لە وەڵامیدا فەرموی:

---

(١) (أخرجه مسلم ٢٨٦٥ عن عياض بن حمار رضي الله عنه.

(٢) أخرجه الترمذي ٣٨٩٥ والبيهقي في السنن ١٥٤٧٧ عن عائشة رضي الله عنها.

(٣) (القلم - ٤).

خبت وخسرت فمن يعدل إذا لم أعدل [١]
رەنجەڕۆ و دۆڕاوم ئەگەر دادگەر نەبم، جا ئەگەر من دادگەر نەبم کێ دادگەرە؟!

ڕاستی کردو دروستی فەرمو، لەسەرتاپای جیهاندا لەوی دادگەرتر نیە، خۆ ئەگەر ئەو دادگەر نەبێ داد لەدنیا دەبڕێتەوەو مەشخەڵەکەی دەکوژێتەوەو خەڵك ڕێیان بەرێی داد ناکەوێ. ئەگەر داد، حوکمەکانی ئەو نەبێ چیترە؟ ئەگەر داد کەسێك بوایە پرسیاری لێبکرایە کە کێ دادگەرترین بونەوەرە؟ دەیگوت: محمد(صلی الله علیه و سلم).

لە دادگەری حوکمەکانی بڕوانە تەنانەت لە ئاست خودی خۆشی هەر دادگەر بو، داوای لە هەندێ یاوەرانی کردوە مافی خۆیانی لێ بستێنن، سوێندی خواردوە ئەگەر فاتیمەی کچیشی دزی بکا دەستی ببڕێ، لە هەق بۆ کەسی لانەداوە، لە حوکمە حەددیەکان تکای کەسی قبوڵ نەکردوە. ئوسامەی کوڕی زەید کە خۆشەویسترین کەس بوە لەلای، جا کاتێك تکا بۆ مەخزومیەکە دەکا. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) هاوار بەرویدا دەکات و دەفەرموێ:

أتشفع في حدّ من حدود الله [٢]
تکا بۆ جێبەجێنەکردنی حەددی خودا دەکەی؟

جارێکیان لەنێوان زۆبێرو پیاوێکی ئەنساریدا ناوبژی دەکات، پیاوە ئەنسارییەکە دەڵێ: بۆیە ئەو حوکمە دەدەی چونکە زوبێر کوڕی مامۆژنتە؟ مەبەستی صەفیەی مامۆژنی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بو، لەمبارەیەوە خوا ئەم ئایەتی دابەزاند:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[٣]

---

(١) أخرجه البخاري، ٣٦١٠ ومسلم ١٠٦٤
(٢) أخرجه البخاري (٣٤٧٥، ٦٧٨٨)، ومسلم ١٦٨٨ عن عائشة رضي الله عنها، ل ١٣٠ .
(٣) (النساء - ٦٥).

سوێند بە پەروەردگارت، نابنە خاوەنی بڕوا، تا تۆ نەکەن نەکەن بە دادوەری کێشەکانیان، بە هەر فەرمانێکی تۆش بیدەی، رازی بن و ختوکە نەخەنە دڵ. ئەوەندە بەسە کە خوا شایەتی لەسەر دادگەری پێغەمبەرەکەی و راستگۆیی حوکمەکانی و دروستیی ناوبژیەکانی داوە.
ئەو خۆی بەرپاکەری دادگەری و ڕوخێنەری کۆشکی ستەم بو لە جیهاندا، دۆست و دوژمن و یارو نەیاران دانیان بەم ئاکارەی ناوە.
ئەوە بکە بەپێوەری رەوشتە هەرە بەرزەکانی، کە هەرچی بانگەوازی بۆ کردوە خۆی یەکەمین کەس بوە پەیڕەوی لێکردوە، کردەکانی راستخەرەوەی وتەکانی بون، ئاکارەکانی ئاوێنەی ناخی بون، ئەندامەکانی سەربازی دڵی بون.
جوانیی دیمەنەکەی، ناونیشانی کتێبی بەها بەرزەکانی بو، دەرگای کۆشکی چاکیە درەوشاوەکانی بو، جوانترین دەموچاو روناکترین نێوچەوان و گەشترین سیماو ڕوخساری هەبو، پێستی تەنك بو، بۆنی خۆش بو، ئارەقەی ساف بو وەك مرواری، بۆنی میسکی لێدەهات، ئەنەس دەڵێ: دەستم لە هەریرو لە هیچ ئاوریشمێ نەداوە هێندەی ناولەپی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) نەرم بێ، هیچ میسك و عەنبەرێکیشم بۆن نەکردوە لە بۆنی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) خۆشتر بێ[1]. پیاو کە تەوقەی لەگەڵ دەکرد تا چەندین رۆژ ئاسەواری بۆنە خۆشەکەی لەناولەپی دەمایەوە.
پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) خاوەن سۆزێکی بەجۆش بو، دڵێکی زیندوی هەبو، بەقسەی خۆش پێدەکەنی و بەگاڵتان دەشنایەوە، بەهەڵوێستان کاریگەر دەبو، بەزەیی هاتبایەوە دڵی نەرم دەبو، زگی بەشتێ بسوتابا دەگریا، ترسی خوا دڵی داگیر دەکرد، لە ئاشتیدا لە هەمو کەس وەفادارترو لە هەمو دۆستان بەڕێزتر بو، لە شەڕیشدا لە(با)ش توندتر هەڵیدەکردو لە تیژەنیش تیژڕۆتر بو، ببەخشیبایە لە هەمو کەسێکی بن ئەم ئاسمانە دەستوالاتر بو، پێیوابو قومێ ئاو دەبەخشێ، کە ڕەزامەندی دەردەبڕی دڵەکان پڕ دەبون لە فەرەحنایی و کۆڕ

---

(١) أخرجه البخاري، ٣٥٦١ ومسلم ٢٣٣٠ .

ئاوەدان دەبوەوەو گەرموگوڕی تێدەکەوت، کە لە هەقێکا توڕە دەبو لە شمشێر گردەبڕترو لە ڕۆژگاریش بە تالوکەتر تاوی دەدا.
بە ددانێکی تەزرە ئاسا پێدەکەنی، بە ئەسرینێکی باران ئاسا دەگریا، بە دەستێکی هەورئاسا دەیبەخشی، بە ڕوێکی سپێدەئاسا ڕوبەڕوی خەڵك دەبوەوە. هاوکۆڕانی لە قسەکانی بێزار نەدەبون، هاوەڵانی لە هاوڕێیەتی وەڕز نەدەبون، ئەوی بیناسیبایە نەیدەتوانی لێی جیابێتەوە.
بە جلێکی ڕەنگ سوری جوانی کراوەو بە ڕوێکی گەش و شادەوە بۆ جەژن دەردەچو، جوانترو شادمانتر لە خودی جەژن و شادمانیەکەی. جەژنی هەرەگەورەی یاوەران ئەوەبو کە بیبینن و گوێ لە وتەکانی ڕاگرن و چێژ لە دیداری وەرگرن. بە دڵی کزۆڵ و چاوی بە فرمێسك و رو لە خوایی دەچوە نوێژی بارانان. مسوڵمانان گەورەترین پەندیان لە ڕوخساری لەخواترسانەو لە فرمێسکە ڕاستگۆکان و دیمەنە کاریگەرەکانی ئەو داوەر دەگرت.
بە دڵێکی قایم و ورەیەکی بەرزو بەڕوحێکی کۆڵنەدەرەوە دەچوە مەیدانی شەڕێ و شەڕی گەرم دەکرد، ڕیزی دوژمنان لە ڕوبەڕوبونەوەیدا دادەتەپین و لە هەڵمەتە مەردەکانی دەپرینگانەوە[1]. ئازاترین سەحابە لە گەرمترین گەرمەی شەڕدا خۆی بەوی دەپاراست، کاراترین تیرهاوێژ لە ساتی مەرگ و ماندا خۆی لە پەنای وی دەنا.

---

(١) پرینگانەوە: سەنگرانەوە .

# خۆشەویستیی محمد (صلى الله عليه و سلم)

﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾[1]

ئەوانەی بڕوایان پێهێناوەو پشتیانگرتوە و یارمەتیان داوەو وەدوی ئەو نورە چون، کە لەگەڵی نێردراوە.

لا يؤمن أحدكم حتّى أكون احبَّ إليه من والده وولده والناس أجمعين [2]
کەستان نابنە بڕوادارێکی تەواو تا منتان لەباوك و منداڵ و گشت خەڵکی خۆشتر نەوێ.

ئەوکەسی ژیانی یاوەران بخوێنێتەوە ئەوە بەدی دەکا کە خۆشەویستیەکی بە کەفوکوڵ و ئێجگار راستیان بۆ خودی پێغەمبەری ئازیز هەبوە، خۆشەویستییەك کە دڵ و دەرون و هەستەکانی داگیرکردون، تەنانەت لەخۆشەویستی دایك و باوك و کوڕو خێزانیش گەورەتر، خۆشەویستییەك کە لە ناخی دڵ و لە کانگەی ڕوحەوە هەڵقولابێ.

بەڵام ئاخۆ بۆچی ئاوا خۆشیانویستوە؟ کە لە تەواوی مێژودا هیچ گەل و نەتەوەیەك نەبوە، بەقەد خۆشەویستی یاوەران بۆ پێغەمبەر، پێشەوا یا رێبەر یا براگەورە یا سەرکردە یا مامۆستاکەیان خۆشویستبێ. سەرو ماڵیان لەڕێ

---

(١) (الأعراف- ١٥٧).

(٢) أخرجه البخاري ١٥، ومسلم ٤٤، عن أنس رضي الله عنه.

دادەناو خۆیان دەکردە قوربانی، لاشەی خۆیان دەدایە بەر تیرو رم و دەبونە مەتاڵ و قەڵغانی، تا ئەو بریندار نەبێ و دور بێ لە تیغی دوژمنانی، هەندێکیان ڕوەوڕو لێیان نەڕوانیوە لەبەر قەدرگرتن و ڕێزلێنانی، هی وا هەبوە بەرەوپیری مەرگ ڕۆیشتوەو نەیشکاندوە فەرمانی، نەك هەر مەرگی لەبەرچاو نەبوە بگرە پێیوابو دەچێتە زەماوەندی ژنهێنانی، هەبو وەك نۆشینی ئاوی زوڵاڵ شەهیدیی هەڵدەنۆشی و بێمنەت بو لەنەمانی، چونکە پڕبەدڵ خۆشیاندەویست ئەو پەیامبەری جیهانیی. ئەویان هێند لەبەردڵ بو، قەت دڵیان نەدەشکاندو بگرە بێدڵی خۆیان دەکردو دڵی ئەویان ڕادەگرت، خۆیان ماندو دەکرد لە پێناوی هەسانەوەی، خۆیان برسی دەکرد لەپێناوی تێربونی، دەنگیان لە دەنگی بەرزتر نەدەکردەوەو کاروباری خۆیان ڕاپێشتر نەدەکرد، دەستیان لە کارێ هەڵنەدەگرت مەگەر بەپرس و فەرمانی، هەر ئەو فەرماندەو پێشەنگی چاك و پێشەوای پیرۆزیان بو، کەسێکیان لەو بە خۆشەویستتر نەدەزانی.

پاڵنەرو هۆکانی ئەم خۆشەویستیەش ئەمانە بون: لە سەروی هەمو هۆکاران ئەوەبو کە پێغەمبەری خوایەو لەناو تەواوی مەردوم و جنان هەڵبژێردراوەو پەیامی پێ سپێردراوە، تا لە تاریکاییەکان ڕزگاریان کاو بیانخاتە سەرڕێی ڕوناك، تا بەرەو بەهەشتێك بیانبات کە بەقەد ئەرزو ئاسمانان بەرهەراوە.

ئەوەشیان بۆ ئاشکرا ببو کە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) پێشەوایەکی کامڵ و خاوەن چاکەو بەخشندەیی بێوێنەیە، ئاکارە پیرۆزو رەوشتە بەرزەکانی هەموانی یەخسیر کردبو، لایان رون بو تا پتر لێی نزیك ببەوەو تا زێتر گوێڕایەڵی بن پتر لە کلێەو کوڵی بێبڕوایی و نەفامێتی دور دەکەونەوەو زێتر بەبەهەشتی فرەوانی ئیمان ئاسودە دەبن، چونکە ئەو بە ئیزنی خوا گیانی لە چڵك و چەپەڵی هەوەستپەرستی و دەرونی لە گوناح و دژوێنی هاوەڵپەرستی و ویژدانی لە ماك و قرێژی کۆتەلان[1] و بتپەرستی پاك کردنەوە. فێری ژیانی پڕ لەڕێزو حورمەتی کردن، شادی بەسینەیان وەرکردەوە دوای ئەوەی تەمەنێکیان لە دودڵی و نیگەرانی و خەم و نائارامی بەسەر برد، کۆشکی یەقینی لەدڵدا دروست کردن

---

(١) کۆتەڵ: پەیکەری پەرستن .

دوای ئەوەی لە کاولگەی دودڵی و گومان و لارێیی[١] وێڵ ببون.
بەر لە بانگەوازەکەی، وەك ئاژەڵان سەرگەردان بون، نە خاوەن بڕواو ڕێوشوێن و نوێژ و زەکات بون، نە خاوەن روناکی و ڕێگەی بنیات بون، لەژیانێکی تاریك و بتپەرستانەو زیناکاری و مەیخۆری و خوێنڕێژی و تالان و بڕۆکاری دەگوزران، چ پەیام و خەبەرێکیان لەبارەی خواو ئاخیرەتا پێ نەبو، لەگومڕایی چەقی بون و نوقم دەبون.
دڵیان لەبەردی رەقترو ناخیان لە شەو تاریکترو حاڵیان لە مردن پەشێوتر بو، عەقڵ و خوێن و ناموسیان پارێزراو نەبو، ماڵیان حەلاڵ نەبو، دەرونیان ئارام نەبو، ڕەوشتیان پەسند نەبو، کۆمەڵگەیەك نەبون ڕێزی چاکەیان لەلابێ، گەلێك نەبون ڕوی داکۆکییان لەبیروڕا بێ.
جا خوا کە ویستی مرۆڤایەتی رزگارو بەختەوەر بکاو ڕەوشی بەچاك بسازێنێ، موحەممەدی ڕەوانە کرد، دەتگوت خەڵك تازە وا لەدایك بونەتەوە، تازە دنیا ڕوی گۆڕیوەو زەوی بەرگێکی دی پۆشیوە. سروش لەلایەن خوای داناوە بۆ سەر ئەم پێشەوایە دادەبەزی، جبریل بەیانی با یا ئێواران شەریعەتی بۆ دەهێنا، شەریعەتێك ڕەشکەرەوەی هەمو شەریعەتەکانی تر بو، مایەی خۆشبەختی بەندان و چاکسازی مەردومان و ئاوەدانی بو بۆ زەوی. مزگەوت دروست دەکران، بەندەو کۆیلە ڕەها دەکران، دڵ ئاوەدان دەبونەوە، جەستە پاك دەبونەوە، نوێژ دەکران و قورئان دەخوێنرایەوە، ئایەت شیدەکرایەوەو واتای فەرمودان هەڵدەدرایەوە، ئاڵای جیهاد دەشەکایەوەو شارستانی دەهاتە کایەوەو گەل هەوای ئازادی هەڵدەمژی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾[٢]

خوا لەناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن، تا بە نیشانەکانی خوایان ئاشنا بکا و لە گوناح پاکیان بکاتەوە و فێری قورئان و داناییان بکا، هەرچەند لە پێشودا لەوپەڕی گومڕاییدابون.

---

(١) لارێیی: انحراف .
(٢) (الجمعة - ٢).

یاوەران پێغەمبەریان (صلى الله عليه و سلم) خۆشدەویست چونکە ئەو خوای پێناساندن و ڕێی ڕەزامەندی خوای پێ ئاشناکردن و بۆ ڕێگەی ڕاست هیدایەتی دان. هەرچەندی خۆشیانویستبێ هێشتا هەرکەمە، چونکە هەر ئەوان بون لەبەر بتپەرستی لەسەر دەمدا کەتبون و هەمبەری بەردان دەپاڕانەوە، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) هات و زایەڵەی دا:

قولوا لا اله الا الله تفلحوا [1]

بڵێن خوا یەك خوایە ڕزگار دەبن.

نوێژی پێکردن و فەرموی:

صلّوا كما رأيتموني أصلّي [2]

چۆنتان دیوە کە نوێژم کردوە ئێوەش ئاوا نوێژ بکەن.

حەجی پێکردن و فەرموی:

أخذوا عنى مناسككم [3]

ڕێوڕەسمەکانی حەج لەمنەوە وەرگرن.

سوننەتی فێرکردن و فەرموی:

من رغب عن سنّتى فليس مني [4]

ئەوەی لە ڕێوشوێنی من لادا، لەمن نیە.

بەرەو تەقوا هەڵینان و فەرموی:

انّ اتقاكم واعلمكم بالله انا [5]

من لەهەموتان بەتەقواترو خواناسترم.

---

(١) أخرجه أحمد، ١٨٥٢٥ والحاكم ٣٩ .
(٢) أخرجه البخاري ٦٣١ .
(٣) أخرجه مسلم ١٢٩٧.
(٤) أخرجه البخاري، ٥٠٦٣ ، ومسلم ١٤٠١.
(٥) أخرجه البخاري، ٢٠.

خوا بەسای ئەو پێغەمبەرە لە ئاگر ڕزگاری کردن، لە کوێریدابون چاوی ڕونکردن، لە نەفامێتیدابون زانستی پێدان، پاشی ئەوەی کە بەدکاربون حاڵی چاك کردن، پاشی ئەوەی کە گومڕابون ڕێنوێنی کردن، پاشی ئەوەی کە سەرگەردان بون لە ڕاستەڕێگا شارەزای کردن.

چۆن یاوەران و بگرە سەرجەم مسوڵمانان خۆشیاننەوێ، لەکاتێکا هەر دەسنوێژێکی کە هەڵیگرن، هەر نوێژێکی کە بیکەن، هەر ڕۆژوێکی کە بیگرن، هەر حەجێکی کە بیکەن، هەر ویردێکی کە بیڵێن، هەر باوەڕێکی کە بیهێنن، هەر ڕەوشتێکی کە بینوێنن، محمد (صلى الله عليه و سلم) یان لەبەرچاوە و لە دیداری دەڕوانن، هەر چاکەیەکی کە بیکەن محمد (صلى الله عليه و سلم) پێشەوایە! هەر کارێکی کە بیکەن تا لە خوا نزیك ببنەوە، هەر محمد (صلى الله عليه و سلم) پێشەنگ سەرمەشقی پرسوڕایە، هەر خزمەتێکی جوان کە پێشکەشی بکەن، هەر محمد (صلى الله عليه و سلم) نمونەو وێنەی هەرە بالایە.

مرۆڤ چۆن ئەو زاتە بەرزەی خۆشناوێ، کە لەگەڵ کردنی هەر کارێکی چاك و نواندنی هەر هەڵسوکەوتێکی مەردانەو هەر ڕەوشتێکی بەرزو پیاوانەدا، فەرمودە جوانەکانی لەگوێچکان دەزرنگێتەوەو دەبێتە میوانی بەردلان.. ئەو فەرمودانەی کە هەمیشە بانگەشە بۆ ڕاستگۆیی و دادگەری و ئاشتەوایی و بەزەیی و برایەتی و چاکەپەروەری دەکەن و مرۆڤ لە بەدیی و خراپەکاری و سەرپێچی و ستەم و دەستدرێژی و پێشێلکردنی هەق و تاوانکاری دور دەخەنەوە.. بێگومان لەدایکبونەوەی دوەمجاری مرۆڤ لەو ڕۆژە دەستپێدەکا کە شوێن ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە هەڵبگرێ و بیکاتە پێشەواو سەرمەشقی خۆی.

بێگومان ئینسان بەوە بەختەوەر دەبێ، کە بێتە سەر ڕێگای ئەو پێشەوایە، چونکە ئەو تاقە کەسێکە کە لەهەر شوێنێ بێ هەق و ڕەوا لەو جێگایە، هەمو وتەیەك بەوتەو کردەوەو حاڵەتەکانی ئەو تەرازو دەکرێن و دەپێورێن.

# بەرەکەتی محمد (صلى الله علیه و سلم)

بەرەکەت لەگەڵیداو لەلای ئەودا دادەباری. وتەکانی موبارەك بون، وتەیەکی کورتی دەفەرمو، بەڵام ئەوەندە بە ئابوتاب و بەرەوانی دەربڕینەوەی و ئەوەندە پەندو ئامۆژگاری لێدەچۆڕی، عەقلی مەردومی سەرسام دەکرد، وتاری ئەوتۆی دەداو خوا هێند سودو بەرەکەت و کاریگەری پێدەبەخشی، کە بەهەزار ئاواز دەنگداتەوەو نەوە بە نەوەی بداتەوە.

عومرێکی موبارەکی بەسەربرد، بیست و سێ سالان پەیامی خوای بەخەڵکی ڕاگەیاند، ئەوەندە خێروبێرو سودو زانست و ئیمان و سەرکەوتن و چاکسازیەی لەو ماوەیەدا بە خەڵکی بەخشی، بەدەیان سەدەو ڕۆژگاری دوورودرێژ نابەخشرێ، لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا توانی پەیامەکەی ڕاگەیەنێ و راسپاردەکەی بگەیەنێ و قورئان فێری خەڵکی بکاو ڕێوشوێنەکانی بلاوکاتەوە، هەروەها بێبڕوایی لەناوبەرێ و و دەوڵەتی داد دامەزرێنێ و مەزنترین شارستانی کە مرۆڤایەتی بەخۆیەوەی دیوە بێنێتەدی.

فەرمو تەنها لە یەك ڕۆژ لە ڕۆژە بە بەرەکەتەکانی بڕوانە کە ڕۆژی قوربانیکردنەو ڕێککەوتی دەی زیلحیججەیە، لەو تاقە ڕۆژەدا نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە بە خەڵکی کردوەو پاشان بە زیکرو پاڕانەوە بەرەو مینایێ ڕۆییوە، خەڵکەکەی بە چۆنیەتی حەجکردن ئاشنا کردوەو وەڵامی پرسیاری حاجیانی داوەتەوە، پاشان ڕەجمی شەیتانی کردوە، پاشان سەری تاشیوە، پاشان چوەتە مزگەوتی حەرام و تەوافی بە دەوری کەعبەدا کردوە، پاشان نوێژی نیوەڕۆی کردوە، وێرای ئەمانە خەڵکیشی ئاراستە کردوە.. هەمو ئەمانەی بەیەك دانە

ڕۆژ تا نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام داوە، کەچی تاکە ئامرازی گواستنەوەشی وشتر بوەو ڕێگاکەشی دورو قەرەباڵغ بوەو خەڵك بۆ پرس و ڕا ڕایانگرتوە. سوبحانەللا لەو خوایەی کە بەرەکەتی خستۆتە سەرجەم ساتەکانی تەمەنی.

ئەو شتی بەجێیدەهێشت بەرەکەت بو، بەلای دو گۆڕ ڕادەبورێ کە مردوێکیان تارەتی میزی بەباشی نەکردوە و خۆی بەجوانی پاك نەکردۆتەوە، ئەوەی تریش دوزمانی کردوە، یەکەو لقە دارێکی لەسەر گۆڕەکان چاندو فەرموی:

أرجو أن يخفَّف عنهما من العذاب حتّى تيبّسا [1]

تەماخوازم تا وشك دەبن، خوا سزایان لەسەر سوك کا. بێگومان ئەم کارە تایبەت بوە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) و بۆ کەسێکی دی دروست نیەو خوا ئەم بەرەکەتەی تەنها بە پێغەمبەر بەخشیوە.

لە ڕۆژی خەیبەردا چاوی عەلی کوڕی ئەبوتالیب توشی چاوئێشە دەبێ و هیچ نابینێ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه و سلم) تفی موبارەکی لە چاوی دەدات و دوعای بۆ دەکا، دەسبەجێ بە ئیزنی خواو بە بەرەکەتی تفەکە چاك دەبێتەوە.

سوپای موسڵمانان لە شەڕی کەنداڵ (خەندەق)دا خۆی لە هەزار کەس دەدا، برسیەتی تەواو شەنگی لا بڕیبون، جابیری کوڕی عەبدوڵلا، پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) و سێ لە یاوەران بانگێشت دەکاتە ماڵێ، کارژۆڵەیەکی سەربڕی بوو هەندێ نانی جۆی ساز کردبو، پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) هەمو لەشکرەکەی بانگکردو خۆشی بەپێشیان کەوت و بەرەو ماڵی جابر بەڕێ کەوتن، فەرموی خواردنەکەم بۆ بێنن، دوعای لەسەر خوێندو تفی موبارەکی کردە ناوی، (دە) کەس (دە) کەس بانگی کردن و لێیان خوارد، تا هەمو تێریان لێخوارد، کەچی خواردنەکە وەکو خۆی مایەوە، پاشان بەسەر ماڵەکانی مەدینەی دابەش کردو ماڵ نەما خواردنی بەرنەکەوێ. سوبحانەللا لەو موعجیزەیە کە نیشانەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕاستگۆیی و بەرەکەت و پێغەمەبەرایەتیەکەی.

جارێکیان لەشکرێکی هەزاروچوارسەد کەسیی لەگەڵدا دەبێ و لە بیاباندا ئاویان

---

(١) أخرجه البخاري (٢١٦، ٢١٨)، ومسلم ٢٩٢ ، عن ابن عباس رضي الله عنهما.

لا دەبڕێ و حاڵیان دەپەشۆکێ و خەریك دەبێ بەهیلاك بچن، پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) فەرموی کوندەیەکم بۆ بێنن کەمێ ئاوی تیدا بێ، هەندێ ئاوی بەسەر دەستە پاك و موبارەکەکانی داکرد، ئیتر ئاو لە بەینی پەنجەکانی هەڵقوڵین، خەڵك دۆلکەو کوندەکانیان هێنا پڕیان کردو وشترو ولاخەکانیان ئاودا، هەروەها تێریان لا خواردەوەو دەسنوێژیان پێ هەڵگرت و خۆیان پێ شوشت.

﴿أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴾[1]

ئاخۆ ئەمە جادوە یا ئێوە کوێربونەو نابینن؟.

خوا بەرەکەتی بەسەر ئەم دەستە پاکەی داباراندوە، کە قەت دزی و گزی و تالان و بڕۆی پێنەکردوەو خوێنی کەسی پێنەڕشتوە.

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص نەخۆش دەکەوێ و تایەکی زۆر گەرم دەیگرێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) سەردانی دەکات و دەستی موبارەکی دەخاتە سەر سینگی، سەعد هەست بە ساردایییەکی بەفرئاسا دەکات و بە ئیزنی خوا شفای بۆ دێ. سەعد دوای تێپەڕبونی چەند ساڵێکیش دەیگوت: ئێستاش هەست بەو ساردایییەی سەر سینگم دەکەم.

پاشماوەی ئاوی دەسنوێژەکەی بەسەر جابری کوڕی عبداللە دەپرژێنێ و بە ئیزنی خوا لە نەخۆشیەکەی چاك دەبێتەوە. لە میناییێ و لە ڕۆژی قوربانیدا سەری دەتراشێ و موەکانی لاڕاستی پرچی بە ئەبوتەلحەی ئەنساری دەبەخشێ، لەپای ئەوەی کە لەناو لەشکردا دەنگی بەقەد سەد سوارچاکان بەرز بوە، موەکانی لاچەپیشی بەسەر خەڵکی دابەش کردو خەریکبو ببێتە شەڕیان و هەرکەس دەیویست بەری کەوێ، هی وا هەبو تاڵەموێکی بەچنگ کەوت، هەبو یەك تاڵەموی دەکردە دو پارچەو پارچەیەکی بە هاوڕێکەی دەبەخشی، هەبو موەکەی لەناو هەڵدێناو ئاوەکەی دەخواردەوە.

ئەبومەحزورە لەوکاتەی منداڵ بو، پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەستی بەسەر پرچی دادێنێ، سوێند دەخوا تامابێ ئەو پرچە نەتراشێ کە پێغەمبەر (صلی

---

(١) (الطور - ١٥).

الله علیه و سلم) دەستی بەسەردا هێناوە، جا تا مردیش موێکی لا نەتراشی.
منداڵ جامە ئاو و شیریان دەهێنایە لای و پەنجەی موبارەکی تێهەڵدەناو بە ئیزنی خوا دەبوە بەرەکەت و شیفا بۆیان.
سەربردە موبارەك و موعجیزە پیرۆزەکانی لەژمارە نایەن، لەهەر شوێنێ بوایەو بۆ هەرکوێ سەفەرو سەردانی بکردایە، بەرەکەت و خێروبێری هەڵدەڕژاند.

# پەروەردەکاریی محمد (صلى الله عليه و سلم)

﴿...يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ.﴾[١]

بە نیشانەکانی خوایان ئاشنای دەکردن و لەگوناح پاکی دەکردنەوە و فێری قورئان و دانایی دەکردن.

إن الله رفيق يحبّ الرفق، ويعطي على الرِّفق ما لا يعطي على العنف [٢]

خوا زۆر نەرمە و نەرمیشی خۆشدەوێ، ئەوشتی لەپای نەرمی دەیبەخشێ، سەبارەت بە توندوتیژی نایبەخشێ.

پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) پەروەردەکارێکی لێزان بو، لە فێرکردن نەرمونیان بو، دەیفەرمو:

ما كان الرفق في شيء إلاّ زانَه، وما نزع من شيء إلاّ شانه [٣]

نەرمونیانی لەهەر شتێکدا بێ جوانی دەکا، لەهەر شتێکیش داماڵدرێ ناشرینی دەکا.

زۆر بە نەرمی دەچوە دلان، خوا لەبارەیەوە فەرمویەتی:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ... ﴾[٤]

---

(١) (الجمعة - ٢).

(٢) أخرجه البخاري ٦٩٢٧ ومسلم ٢٥٩٣ عن عائشة رضي الله عنها.

(٣) أخرجه مسلم ٢٥٩٤ عن عائشة رضي الله عنها.

(٤) (آل عمران - ١٥٩).

بەسای بەزەیی خوایە کە تۆ هێندە لەگەڵیان نەرمی، ئەگەر کەسێکی توندوتوڕەو دڵڕەق بای، بلاوەیان لێدەکردی .
پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ئەو کەسە بو کە پتر لە هەمو خەڵکان، ڕەوشتەکانی قورئانی دەنواند، بۆیە نزیك و خۆشەویست بو لەناو دلان.
بیابانییەك دێتە لای و دوای شایەتمان دەڵێ: خوایە ڕەحم بەمن و بە محمد بکەی و بە کەسی تر نا.
ئەویش دەفەرموێ:
لقد حجرت واسعا [١]
ڕەحمەتی بەرهەراوی خوات بەرتەسك کردەوە.
پاشان بیابانییەکە هەڵدەستێ و لە پەرگەیەکی ناو مزگەوتێ دەمیزێ، هەندێ لە سەحابەکان دەیانەوێ تێیرڕوکەنێ و لێیدەن، بەلام پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لێناگەرێ و داوای دۆلکەیێ ئاو دەکات و بەسەر جێمیزەکەی دادەکا، پاشان بانگی بیابانییەکە دەکات و بە وتەیەکی نەرم و بە ڕەوشتێکی زۆر جوانەوە پێیدەڵێ:
إن هذه المساجد لا يصلح فيها شيء من الأذى والقذر، وإنما هي للصلاة والذكر و قراءة القرآن [٢]
مزگەوتەکان بۆ نوێژ و زیکرو قورئان خوێندنن و ناشێ شتی پیس و قێزەونیان تێدابێ.
بیابانیەکە بەم نەرمییە سەرسام دەبێت و دەگەرێتەوە لای هۆزەکەی، بەرەو ئیسلام بانگیان دەکاو ئەوانیش دەبنە مسوڵمان.
کورێژگەیەك لەسەر سفرەی خواردن لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دادەنیشێ، کە خواردن دەخوا دەست بۆ هەمو لاکانی لەگەنەکە درێژ دەکا.
بەلام پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) خۆی لا گرژ ناکات و بەسەر خۆی

(١) أخرجه البخاري، ٦٠١٠ عن أبي هريرة.
(٢) أخرجه مسلم، ٢٨٥ عن أنس بن مالك رضي الله عنه.

نایشکێنێتەوە، بەڵکو زۆر بە نەرمی پێی دەفەرموێ:

سمّ الله وكل بيمينك وكل ممّا يليك [١]

ناوی خوا بێنەو لەلای خۆتەوە پارو هەڵگرە.

جولەکەیەك دێتە لای و دەڵێ: (السّام عليك: مەرگت لەسەر بێ) عائیشەش دەڵێ: (وعليكم السّام واللعنة: مەرگ و نەفرەت لەسەر ئێوەش).

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) دەفەرموێ:

يا عائشة، ما هذا؟ إن الله يكره الفحش والتفاحش، وقد رددت عليهم ما قالوا، فقلت: وعليكم [٢]

ئەی عائیشە ئەمە چیە؟! خوا ڕقی لە جوێن و شەڕەجوێنانە، من هەر ئەوەندە وەڵامیانم دایەوە کە وتم: وعليكم: لەسەر ئێوەش.

لە فەرهەنگی ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) و کەشکۆڵی ڕەوشتەکەیدا تاقە وشەیەکی ناشرین و نالایەق و تەنانەت جوێنێکیشی تێدا نیە، بگرە هەموی هەر بێگەردو بێ لەکەو بێ ماك و پاك و نەرم و پڕنەمەکن. چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) نیعمەت و ڕەحمەتێکی هیدایەتکاری خوایی و بەرەکەت و خێروبێرێکی بەبڕستی بەردەوامە بۆ مرۆڤایەتی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لێکدا لێکدا کۆڕی ئامۆژگاری بۆ یاران نەبەستوە، نەبادا توشی بێزاری و وەڕسی بن، بەڵکو ناوەناوە ئامۆژگاری دادەدان و ماوەماوەش هیچی بۆ نەدەفەرمون، تا گوڕوتین بە دەرونیان وەربێتەوەو دڵیان ئارام بێتەوە، ئامۆژگاریەکانیشی کورت و پوخت و پاراو بون، فەرمانی بەوەش کردوە کە نوێژەکان زۆر درێژ نەکرێنەوەو وتارەکان درێژدادڕ نەبن و خەڵك نەخەنە هەراسانیەوە، دەیفەرمو:

إن قصر خطبة الرجل وطول صلاته مئنة من فقهه [٣]

---

(١) أخرجه البخاري (٥٣٧٦، ٥٣٧٨) ومسلم ٢٠٢٢ عن عمر ابن أبي سلمة رضي الله عنه.
(٢) أخرجه البخاري (٢٩٣٥، ٦٠٣٠) ومسلم ٢١٦٥ عن عائشة رضي الله عنها.
(٣) أخرجه مسلم ٨٦٩ عن عمار رضي الله عنه.

کورتکردنەوەی نوێژ و کەمێ درێژکردنەوەی نوێژ نیشانەی لە دین گەیشتنە.
عومەر نارەزایی لەحەبەشیەکان دەربڕی کە لە مزگەوتێ یاری نەکەن، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) فەرموی:

دعهم يا عمر، ليعلم يهود أن في ديننا فسحة [١]

عومەر لێیانگەڕێ، با جولەکە بزانن دینەکەمان فرەوانە.
ئەبوبەکر لە ماڵی عائیشەدا دەبێتە میوانی پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم)، دەبینێ دو کەنیزە بەبۆنەی جەژن، دەف لێدەدەن و گۆرانی دەڵێن، بە نارەزاییەوە دەڵێ: ماڵی پێغەمبەرو زرەزرِی شەیتان!
بەڵام پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) دەفەرموێ:

دعهم يا أبا بكر، فإن لكل قوم عيدا وهذا عيدنا [٢]

ئەبوبەکر لێیانگەڕێ، هەمو گەلێ جەژنێکی هەیە، ئەمەش جەژنی ئێمەیە.
پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) لە عائیشە دەپرسێ، کە لە زەماوەندی ژنگواستنەوەی ئەنسارییەکان بەشداری کردبو:

هل كان معكم شيء من لهو؟ -أي من طرب- فإن الأنصار يعجبهم اللهو [٣]

ئایا دەف و گۆرانی هەبون؟ چونکە ئەنسارییەکان حەزیان لە گۆرانییە.
دەف لێدان و گۆرانی گوتن لەسنوری موباحدا بون، کە مایەی هێوربونەوەی دەرون و رادانی وەڕسی و بێزارییە، بەڵام ئەو شتی حەرام بو پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) لە هەمو خەڵکی لێی دورتر بو.
پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) بە کردەوە پێشەنگیان بو، داوای لێدەکردن لە خوا بترسن و خۆی لە هەموان بە ترستر بو، نەیدەهێشت لە خراپە نزیك بن و خۆی لە هەموان بە دورتر بو، ئامۆژگاری دەکردن و فرمێسکە موبارەکەکانی بەسەر ڕومەتی پیرۆزی دەهاتنە خوارێ، داوای لێدەکردن خاوەنی جوانترین

(١) أخرجه أحمد (٢٤٣٣٤، ٢٥٤٣١) عن عائشة رضي الله عنها أنظر كشف الخفاء: ٦٥٨.
(٢) أخرجه البخاري ( ٩٥٢، ٣٩٣١) ومسلم ٨٩٢ عن عائشة رضي الله عنها.
(٣) أخرجه البخاري ٥١٦٣ عن عائشة رضي الله عنها.

ڕەوشت بن، خۆشی خاوەنی جوانترین ڕەوشت بو، پێی دەفەرمون یادی خوا بکەنەوە، خۆشی لە هەموان یادەوەرتر بو، هانی دەدان لە پێناوی خوا زۆر ببەخشن، خۆشی لە هەموان بەرچاوتێرو بێباکتر بو، پێی دەفەرمون لەگەڵ خاوخێزانیان باش بن، خۆشی لە هەموان باشترو لە هەموان پتر رەحم و سۆزو نەرمونیانی بۆ دەردەبڕین.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) هێند بەژێهاتی نەونەمامی چاکەی لە دڵی یاوەرانیدا دەڕواند، کە تا لەژیاندا بون وشکی نەدەکردو هەر گۆپکەی دەکرد، پشت بەپشت و دێ بە دێ و شار بە شاریش ئەو نەمامەیان موتوربە کردۆتەوە، پیاو ئەگەر ڕۆژێ یا چەند ساتێ لەگەڵی بوایە بڕوای پێدەهێناو وازی لە بێبڕوایی دێنا، کاریگەرێکی ئەوتۆی لەسەر بەجێدەهێشت کە تا مردن نەڕەوێتەوە، ئەو ڕۆژ و ساتانەی کە پێغەمبەری (صلی الله علیه و سلم) تێدا دیوە، دەبوە یادگاری ئەمرو وایدەزانی ژیانەکەی هەر هێندە بوە کە لەگەڵ ئەو زاتە بەرزە بوە.

هەمو ئەمانە لەبەرئەوە بو کە ئەو پێغەمبەرێکی ڕاستگۆی خودایی بو، بانگەوازی موبارەك بو، دڵسۆزو میهرەبان و بەهەیبەت و ئاکار جوان و بەخشندە بو.

# سه‌ڵاوات لێدان له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه و سلم)

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾[1]

خواو فریشتان درود ده‌نێرن بۆ سه‌ر پێغه‌مبه‌ر، بڕواداری‌نه‌! ئێوه‌ش درود بنێرن و سه‌لاوه‌تان لێده‌ن.

سه‌ڵاوات لێدان سۆمای چاوانه‌، شادیی دلانه‌، پاراویی زمانه‌، ئارامیی گیانه‌، میسکی کۆڕانه‌، گولاوی ژیانه‌، جوانیی رۆژانه‌، بۆ دیده‌ نوره‌، زه‌کاتی عومره‌، رونیی بینینه‌، خه‌فه‌تڕه‌وێنه‌، ئاسوده‌هێنه‌، فه‌ڕدابه‌زێنه‌، هه‌دابزوێنه‌. مایه‌ی خۆشی شه‌وچه‌ران، شیرینی وته‌و قسان، نیشانه‌ی خۆشه‌ویستی و رێی پێغه‌مبه‌ر گرتنه‌، به‌ڵگه‌ی چاکه‌په‌روه‌ری و هانا بۆ دین بردنه‌.

پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه و سلم) فه‌رمویه‌تی:

من صلى عليّ صلاة واحدة صلى الله عليه بها عشر صلوات، ورفعه عشر درجات، وكتبت له عشر حسنات، ومحي عنه عشر سيئات [2]

ئه‌وی یه‌ك سه‌ڵاواتم له‌سه‌ر لێدا، خوا (ده‌) جاران به‌ره‌كه‌تی به‌سه‌ردا هه‌ڵده‌ڕێژێ و (ده‌) پله‌به‌رزی ده‌كاته‌وه‌، (ده‌) چاكه‌شی بۆ ده‌نوسرێ و (ده‌) گوناحی هه‌ڵده‌وه‌رێ.

---

(١) (الأحزاب - ٥٦).

(٢) أخرجه النسائي في الكبرى ٩٨٩٠ وفي عمل اليوم والليلة٦٣ عن أنس بن مالك.

أكثروا عليّ من الصلاة ليلة الجمعة ويوم الجمعة [١]
له شەوان و رۆژانی هەینییاندا زۆر سەڵاواتم لەسەر لێدەن.
رغم أنف من ذكرت عنده ولم يصلّ عليّ [٢]
هەشبەسەری ئەوکەسی کە ناوی منی گوێ لێدەبێ و سەڵاواتم بۆ نانێرێ.
البخيل من ذكرت عنده فلم يصلّ عليّ [٣]
قرچۆك ئەو کەسەیە، ناوی منی بەرگوێ کەوێ و سەڵاواتم بۆ نەنێرێ .
إن لله ملائكة سياحين في الأرض يبلغونني من أمتي السلام [٤]
خوا فریشتەی گەڕیدەی هەن، بەزەویدا دەگوزەرێن، ئەوی سڵاوم بۆ بنێرێ خوا پێمی دەگەیەنێ.
ئوبـەی کوڕی کەعب پێی دەڵێ: لەمەودوا دوعاکانم لەبۆ تۆیە، پێی دەفەرموێ:
إذن يغفر ذنبك، وتكفي همّك [٥]
کەواتە خواش لە گوناهت دەبورێ و بەخەم و هاوارت ڕادەگا.
لە تەحیاتی گچکەو گەورە، لەکاتی ناو هێنانی، لە وتاری جەژن و جومعان، لە کردنی نوێژی بارانان، لە مارەبڕینی ژنان، لە کۆڕی ئامۆژگاری، لە نامەو لە پەیامان، لە گرێبەست و ڕێککەوتنان، لە وەختی سەفەرکردن، لە نزاو پاڕانەوە، لە زیکری سبەینان و ئێواران، لە پێشهات و وەختی خەمان، لە توشبونی بەلای زەمان، لە موژدەو مزگێنیان، لە نوسینی کتێبان، لە لێکدانەوەی فەرمودان، لە نوسینەوەی ژیانی، لە باسی بەسەرهاتی، درودو سڵاوی بۆ دەنێرن.

---

(١) أخرجه ابن عدي في الكامل ١٠٢\٣ والبيهقي في الكبرى ٥٧٩٠ وفي الشعب ٣٠٣٠ عن أنس بن مالك وانظر كشف الخفاء ١٩٠\١.
(٢) أخرجه أحمد ٧٤٠٢ والترمذي ٣٥٤٥ والحاكم ٢٠١٦.
(٣) أخرجه أحمد ١٧٣٨ والترمذي ٣٥٤٦ عن علي رضي الله عنه وانظر كشف الخفاء ٣٣٢\١ .
(٤) أخرجه أحمد (٣٦٥٧، ٤١٩٨) والنسائي ١٢٨٢ والدارمي ٢٧٧٤ والحاكم ٣٥٧٦ عن عبدالله بن مسعود .
(٥) أخرجه الترمذي ٢٤٥٧ .

لەگەڵ شنەباو سروەو شەمالان، لەگەڵ بلاوەی دەنکە هەڵاڵان، لەگەڵ شکەفتی گوڵ و گولالان، درودو سڵاوی خوات لەسەر بێ. لەگەڵ لێکدانی باڵی باڵی مەلان، لەگەڵ جریوەو جیکەی بولبولان، درودو سڵاوی خوات لەسەر بێ. لەگەڵ تنۆکی دڵۆپەی خوناوان، لەگەڵ تنۆکی ڕۆندکی چاوان، درودو سڵاوی خوات لەسەر بێ. لەگەڵ رەهێڵە و نمنمەی باران، لەگەڵ چەکەرەی چرۆی بەهاران، لەگەڵ هاژین و ورشینی داران، درودو سڵاوی خوات لەسەر بێ. لەگەڵ تارینی ئازارو خەمان، لەگەڵ زریوەی ئەستێرەی ئاسمان، لەگەڵ ڕەوینی گەواڵەی هەوران، لەگەڵ هاتنی موژدە و خەبەران، لەگەڵ شادبونی سیماو روخساران،درودو سڵاوی خوات لەسەر بێ.. هەروەها لەسەر خانەوادەی پاکیزانت، یاری کۆچەرو پشتیوانانت، دڵسۆزان و شوێنکەوتوانت.

# ئەدەبنواندن لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله علیه و سلم)

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾(١)

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەر بەرز مەکەنەوە، دەنگتان بەو شێوازە بەرز نەبێ کە لەگەڵ یەکدی دەدوێن، نەبادا کردەوەکانتان پوچەڵ بێتەوەو پێشی نەزانن.

ئەدەبنواندن لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله علیه و سلم) بەندێکە لەشەریعەتی ئیسلام و ئەوەی بینوێنێ پاداشت وەردەگرێ، ئەوەی نەینوێنێ سزا وەردەگرێ. ئەدەبنواندن و گەورەگرتن و ڕێزلێگرتن و بەشکۆدارو پایەدار زانینی، هەروەها ڕەخنە لێنەگرتن و قسەنەبڕین و لە قسە دەرنەچون و بەڕاست و بێخەتازانین و ڕاپێشنەکردنی قسەی خەڵکانی تر، جا هەرچی و چۆنێکیان گوتبێ، هەروەها بە وشك و دڕدۆنگ نەڕوانین لە وتەکانی و ڕەتنەکردنەوەی فەرمودەکانی، گومان نەبون لەناوبژی و بڕیارەکانی، بەرزترگرتنی لە گشت سەرکردەو ڕێبەرو پاشایان، لە دین دەرچون و زێدەڕۆیی نیە، چونکە ئەو پێغەمبەری خوایە، خاوەن ئەوپەڕی شکۆ و ڕێزانە و پایەی هەرەبالایە.
بگرە بە پێچەوانەوە ڕەخنەگرتن و لێدڕدۆنگبون و لوتهەڵبڕین لە ئاستیدا

---

(١) (الحجرات - ٢).

حەرامە، واجیبیشە کە پیاو بڕوای پێ بێنێ و بە پێغەمبەر قبوڵی بکاو لە ماڵ و منداڵ و خەڵکی خۆشتری بوێ، هەرچی ڕایگەیاندوە بە ڕاست و دروستی بزانێ و فەرمانەکانی جێبەجێ بکاو خۆی لە (نا)کانی بپارێزێ، لە ڕێگای لانەدات و ڕێوشوێنی بەرنەدات و ڕازی بێ بە بڕیارو بە پێچەوانە ڕەفتار نەکات، کە ناوی دێنن ڕێزو حورمەتی بۆ بنوێنێ، دەنگی خۆی لەمەڕ باس و بەسەرهاتی بەرز نەکاتەوەو گاڵتە و پێکەنینی ڕاگرێ و ملکەچی سوننەتەکانی بێ، کە بەڵگە بە وتەکانی دێننەوە ئەدەب بنوێنێ، بڕوا بە موعجیزەکانی بێنێ و داکۆکی لە کەسایەتی و کەس و یارانی بکات.

﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾[1]

ئەوانەی بڕوایان پێهێناوەو پشتیانگرتوە و یارمەتیان داوەو وەدوی ئەو نورە چون، کە لەگەڵی نێردراوە.

موسڵمان دەبێ هاوشێوەی سەحابەکانی محمد (صلى الله عليه و سلم) ئەدەب بنوێنێ، سەحابە هەبوە لە حزوریدا بە دەنگێکی کزو پڕ لەڕێزەوە نەبوایە نەدەدوا، کە ئەو دەدوا چرپەیان لا نەدەبیسترا، سەحابە هەبوە بەرەو مزگەوتێ چوە، کە گوێی لا بوە لەناو مزگەوتێ بە خەڵکی فەرموە:

يا أيها النّاس اجلسوا [2] خەڵکینە دانیشن.

یەکسەر لە شوێنی خۆی دانیشتوە، کەچی هێشتا لە ڕێگادا بوە و نەگەیشتۆتە ناو مزگەوتێ، سەحابە هەبوە سوێندی خواردوە تاماوە قسە لەگەڵ کوڕەکەی نەکا، چونکە دژ بە قسەی پێغەمبەر وەستاوە.. دەیان و دەیان هەڵوێستی ناوا جوان و مەردانەی تر، کە دیمەنی ئەوپەڕی ئەدەبنواندن لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه و سلم).

---

(١) (الاعراف- ١٥٧).

(٢) أخرجه أبو داود ١٠٩١ والحاكم ١٠٥٦ عن جابر رضي الله عنه .

# مزگێنـی پێغـەمبـەر (صلی الله علیه و سلم)

﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾(١)

مۆژدە بدە بڕواداران کە لەلای خوادا پلەوپایەکی گەورەیان هەیە.

بشّروا ولا تنفّروا، ويسّروا ولا تعسّروا

مۆژدە بدەن و خەڵك لە دین هەڵوەدا مەکەن، ئاسانکار بن و دین لەخەڵکی سەخت مەکەن. یەکێك لە مەزنترین ئاکارەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) مزگێنیدان و مزگێنیدەر بو:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾(٢)

ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان وەك گەواهیدەرێکی مۆژدەبەخش و ترسێنەر هەناردوە. مزگێنی هەرەگەورەی لەگەڵ خۆ هێنا کە بڕواهێنانە بەخوا، مزگێنی دا کە خوا خاوەن ڕەزامەندی و بەزەیی و لێبوردنە، مزگێنیدا کە بەهەشت هەیەو هێندەی ئەرزو ئاسمانان بەرینە، مزگێنیدا کە هەرکەسێ تۆبە بکا خوا لێی وەردەگرێ و لە پەژیوانان دەبورێ. دین و دینداری پڕ لە مزگێنی و مۆژدەکانی ئەون، مزگێنیدا کە دەسنوێژ هەڵکڕێنی گوناهانە، نوێژ و ڕۆژی و حەج و عومرە لابەری گوناهانی نێوانیانە گەورەکانی لێدەرچێ، مزگێنیدا بەوانەی کە نابینان بەهەشتین، مزگێنیدا بەوانەی کە کوڕیان دەمرێ و ئارامگرن بە کۆشکێکی نێو بەهەشتێ خەلات دەکرێن، مزگێنیدا بەوانەی کە توشی نەخۆشی دەبن گوناهیان پێهەڵدەوەرێ و ئەوەی کە خواش خۆشی بوێ دەیخاتە بەر

---

(١) (الأحزاب - ٤٧).
(٢) (الأحزاب - ٤٥).

ئەزمونەوە، مزگێنیدا بەوانەی کە دەسنوێژیان هەڵگرتوەو چاوەڕوانی نوێژێ دەکەن و مادەم دەسنوێژیان ناشکێ فریشتەکان درودبارانیان دەکەن، مزگێنیدا بەوانەی کە سوبحانەڵلایێ دەڵێن درەختێکیان لەبەهەشتێ بۆ دەڕوێ و ئەوی کە سەد جاریش بڵێ: (سبحان الله وبحمده) سەرجەم گوناهەکانی لەکۆڵ دەبێتەوە ئەگەرچی زۆریش بن وەك کەفی دەریا، هەروەها ئەوکەسی گوناهێ دەکاو پاشان دەسنوێژێ دەشواو ڕوی تکای لە خوا دەکا خوا لێی دەبورێ، مزگێنیدا بەوانەی کە دەردو نەخۆشی دەگرن یا کەنەفت و شەکەت دەبن، یا خەم و دڵتەنگیێ یەخەیان دەگرێ و ئەزیەت دەبینن تەنانەت ئەگەر چقڵێ لە پێیان ڕاچێ خوا گوناهیان پێ پاك دەکاتەوە.
کتێبێکی مەزن و یادێکی دانای (الذکر الحکیم) بۆ هێناوین و مزگێنی دەدا بەوانەی کە چاکە دەکەن پاداشتێکی پڕ بەدڵ وەردەگرنەوەو پێشیفەرمون کە توشی بێهومێدی نەبن.

﴿...إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾[1]

کەس لە ڕەحمی خوا هیوابڕ نابێ مەگەر گەلۆی بێبڕوایان.
پێی فەرمون لە ڕەحمی خوا هیوابڕ نەبن:

﴿...وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾[2]

ومن يقنط من رحمة ربه إلا الضّالون: جا کێ هەیە لە بەزەیی خوا ناهۆمێد بێ مەگەر گومڕایان.
دوچاری دڵتەنگی مەبن:

﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟﴾[3]

خۆتان بە لاواز مەزانن و دڵتەنگ مەبن.

---

(١) (یوسف - ٨٧) .
(٢) (الحجر - ٥٦).
(٣) (آل عمران - ١٣٩).

دەرگای لێبوردنی بۆ تۆبەکاران خستۆتە سەرپشت:

﴿قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾[1]

بڵێ ئەی ئەوانەی بەندەی خوان و گوناهتان بە زێدەڕۆیی کردوە، لە ڕەحمی خوا ناهومێد مەبن، خوا لە هەموو گوناهێ دەبورێ، خوا لێبوردە و میهرەبانە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) کە نێردەکانی بە هەرێماندا بلاوکردەوە تا بەرەخوا خەڵکی بانگ بکەن، پێیفەرمون:

بشّروا ولا تنفّروا، ويسّروا ولا تعسّروا

موژدە بدەن و خەڵك لەدین هەڵوەدا مەکەن، ئاسانکار بن و دین لە خەڵکی سەخت مەکەن. موسڵمانانی وریا کردۆتەوە کە دین بە توندی نەگرن و خەڵك لە دین وەرز نەکەن و فەرموی:

يا أيها الناس! إن منكم منفّرين، من صلى بالناس فليخفف، فإن فيهم الكبير والصغير والمريض وذا الحاجة[2]

خەڵکینە هی واتان هەیە خەڵك لە دین هەڵوەدا دەکا، ئەوەی پێشنوێژی کرد با نوێژی کورت کاتەوە، چونکە پیرو منداڵ و نەخۆش و خاوەن پێویستیش لە دواوەی نوێژ دەکەن.

سەرکۆنەی ئەوانەی کردوە کە باری دینداری خەڵکی قورس دەکەن، مزگێنی بە عائیشە داوە کە ئەو لەوجۆرە کارانە بێبەرییە، مزگێنی بە کەعبی کوڕی مالیك داوە کە خوا تۆبەی لێوەرگرتوە، مزگێنی بە جابیر داوە کە خوا لەگەڵ باوکی ئاخاوتوە، مزگێنی بە مسوڵمانان داوە کە زەیدو جەعفەرو ئیبنی ڕەواحە بەهەشتین، مزگێنی بە بیلال داوە کە گوێی لە خشپەی کەوشەکانی ئەو بوە لە بەهەشتێ، مزگێنی بە ئوبەی کوڕی کەعب داوە کە خوا لەلای فریشتە

---

(١) (الزمر - ٣٥).

(٢) أخرجه البخاري (٩٠، ٧٠٢) ومسلم ٤٦٦ .

هەرەبەرزەکان ناوی بەچاك بردوە، مزگێنی بە (دە) یارەکەی داوە کە بەهەشتین، مزگێنی بە جەنگاوەرانی بەدر داوە کە خوا پێیفەرمون:

اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم [1]

چیدەکەن بیکەن، خوا لێتان خۆشبوە.

ئەوانەی لەژێر درەختەکەدا بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بەستوە، مزگێنی پێداون کە خوا لێیان ڕازییە. ئەوەی هەردەم بڵێ:

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ [2]

مزگێنی پێداوە کە خوا خۆشی دەوێ، پیاوێك کە گوناهێکی شایەن بە حەدد لێدەرکردنی کردبو، دوای ئەوەی نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) کرد، مزگێنی پێدا کە خوا لە گوناهەکەی خۆشبوە.

هەڵبەت کە یەکێك لە ئاکارە جوان و جێ سوپاسەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) ئەوەبو، کە مزگێنی بداتە خەڵکان و شادی بخاتە دڵیان.

---

(١) أخرجه البخاري (٣٠٠٧، ٣٩٨٣)، ومسلم ٢٤٩٤ عن علي رضي الله عنه.

(٢) (الإخلاص - ١).

# ماموٚستایەتی
# پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)

﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾[1]

شتی وای فێرکردی کە پێشتر نەتزانیوە، بەڕاستی چاکەی خوا بەسەرتەوە زۆر گەورەیە.

من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهّل الله له به طريقا الى الجنة [2]

ئەوەی ڕێگای زانست بگرێتە بەر خوا ڕێی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بە ماموٚستا نێردراوە، تا خەڵك فێری ڕەوشتی جوان و کردەوەی ڕێك و ئاکاری مەردانەو هەڵسوکەوتی پەسند بکا.

کە ئامۆژگاری دەکردن، دڵی وا دەخستنە جۆش و خرۆشەوە، دەتگوت وا دیدەوانی سوپا هاواریان دەکاتێ: گەلۆ زوکەن خۆ شەتەك دەن، خەریکە دوژمن بگاتە سەرتان. کە خوتبەی بۆ دەدان لە توڕەییان سور هەڵدەگەڕا، پڕمەی گریان و نرکەو ناڵەو ئاهی حەسرەت و پەشیمانی خەڵکەکە ئەو ناوەی پڕ دەکرد، گشتیان پەژیوان دەبونەوەو تکاو سکلایان دەبردە بەر بارەگای خوا.

لە ڕێی وتارە بەهادارو پڕسودەکانی کە لە بۆنە پەرستەنیەکان پێشکەشی دەکرد، کە وەك لافاوێك لە هیدایەت و ڕوبارێك لە نور بون، خەڵکەکەی فێر دەکردو بڕوای بەرز دەکردنەوەو یەقینی قایم دەکردن.

لە ڕێی ئەو فەتوایانەی کە بۆ ئەو کەسانەی دەدا کە پرسیاریان لێدەکرد،

---

(١) (النساء - ١١٣).

(٢) أخرجه مسلم ٢٦٩٩ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

خەڵکەکەی فێر دەکرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لە هەمو خەڵکی تێگەیشتوترو وەڵامەکانی دروستتر و پڕ بایەختر بو، لە دەرمانی حاڵی بیماران شارەزا بو و لە وەڵامان نەخشی دێنا.

لە ڕێی ئامۆژ و ڕاسپاردەکانی، کە دڵ و دەرونی بەچاکی و پاکی و ترسی خوا ئاوەدان دەکردەوە، خەڵکی فێر دەکرد، ئانەی سەرچاوانی لادەداو ڕێی تاریکی بۆ ڕوناك دەکردنەوە.

بە هێنانەوەی ئەو نمونانەی خەڵك پێی ئاشنابون و بەرهەست بو بۆیان فێری دەکردن، ماناکانی بۆ شیدەکردنەوەو پاك و پوکی هاوێر دەکرد، ڕاستی و ناڕاستی شەن و کەو دەکردو تەمومژی وەهمی لە هەقیقەت دەڕەواندەوە.

بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی دڵڕفێن و سەرنجراکێش فێری دەکردن، بەسەرهاتی وا کە کاریگەری و سەرسامی دەخستە دلان و پەندو وانەی پێدەبەخشین.

وەك پێشەنگێکی کارامەو بەرچاو، بە ڕێژینە گولاوین و ڕەوشتە هەرەبەرزو ئاکارە شیرنەکانی فێری دەکردن، ئەو ڕێژینەی کە تەواوی هۆشمەندان پێیان جوانەو سەرجەم تەقواداران خوشیانویستوەو گشت ئەولیا پەیڕەویان لێکردوە.

یەکەم وشە کە بۆی دابەزی (بخوێنە) بو، کە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕێزی زانست و نرخی مەعریفەت، هەروەها خوا فەرمانی پێکردوە کە بڵێ: خوایە زانستم زۆرتر کە، تەنها بۆ زانست فەرمانی پێکردوە داوای زێدەبون بکا، چونکە زانست ڕێی ڕەزامەندی خواو ڕێبازی ڕزگاربونە. خوا منەتی لەسەر دەکا کە زانست و مەعریفەیەکی ئیمانی و بەهرەو بلیمەتێکی وای فێرکردوە، کە پێشتر سەرەدەری لێدەرنەکردوە. خوا پێیفەرموە:

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ... ﴾[1]

بزانە کە خوا یەك خوایە و خواوەندی تر لە ئارادا نیە.

پێغەمبەریش لە زانستەوە دەستی پێکردوە، ئینجا وتەو کردەوە. پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) پێشەوای زانایان و پێشەنگی فێرخوازانەو هەمیشە دەتوانن

---

[1] (محمد - ١٩) .

زانست و کردەوەی چاکی زیاتری لیٚ فیٚربن و فەرمویەتی:
مثل ما بعثني الله به من الهدى والعلم كمثل الغيث [١]
من و ئەو هیدایەت و زانستەی کە خوا پیٚی ناردوم وەکو بارانی پڕ بەرەکەت وایە. ئەرکی هەرە گەورەی ئەوەبو، کە خەڵك فیٚری قورئان و دانایی بکا .
﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾[٢]
فیٚری قورئان و داناییان دەکا.
له کانیاوی زانست و مەعریفەی ئەو پیٚغەمبەرەدا چەندین یاوەر بون بە زاناو فیقهناس و داناو تەفسیرزان و فەرمودەناس و فەتوادەرو وتاربیٚژ و پەروەردەکاری گەورە گەورەو دنیان لەزانست و دانایی و هۆش و هۆشیاری پڕکرد.
پیٚغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) مسوڵمانانی هان داوە، فیٚری زانست بن و بلاوی بکەنەوەو خەڵکی فیٚرکەن، وەك لە حەجی ماڵئاواییدا بە خەڵکی فەرمو:
فليبلغ الشاهد الغائب، فربّ مبلّغ أوعى من سامع [٣]
ئەوی لیٚرەیە با بەوانەی ڕاگەیەنیٚ کە لیٚرە نین، چونکە رەنگە ئەوەی پیٚی ڕادەگەیەنریٚ باشتر تیٚبگات لەو کەسەی کە گویٚ بیست دەبیٚ.
نضّر الله امرءا سمع مقالتي فوعاها وحفظها وبلّغها، فرُبّ حامل فقه الى من هو أفقه منه [٤]
خوا ئەو کەسە شادو بەختەوەر کا، کە وتەکانی منی گویٚ لیٚدەبیٚ و تیٚیدەگات و لەبەری دەکات و ڕایدەگەیەنیٚ، رەنگە هی وا هەبیٚ فیقهەکەی بە کەسیٚکی فیقهزانتر بگەیەنیٚ.
بلّغوا عنّي ولو آية [٥]

---

(١) أخرجه البخاري ٧٩ ومسلم ٢٢٨٢ .
(٢) (البقرة - ١٢٩) .
(٣) أخرجه البخاري (١٧٤١، ٧٠٧٨) ومسلم ١٦٧٩ عن أبي بكرة رضي الله عنه.
(٤) أخرجه الترمذي ٢٦٥٨ عن ابن مسعود رضي الله عنه وانظر: كشف الخفاء ٤٢٣٦٢.
(٥) أخرجه البخاري ٣٤٦١ عن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما.

ئه‌وه‌ی من ده‌ڵێم بیگه‌یه‌نن، ئه‌گه‌رچی ئایه‌تێکیش بێ.
ژیانی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه و سلم) هه‌موی بریتی بو له‌ فێرکردنی ئومه‌ته‌که‌ی، له‌ نوێژ و ڕۆژی و زه‌كات و به‌خشین و حه‌ج و زیكرو وته‌و هه‌ڵسان و دانیشتن و خواردن و خواردنه‌وه‌كانیدا، سه‌رمه‌شق و مامۆستا بو بۆ ئه‌وانه‌ی بروایان پێهێنا بو و په‌یڕه‌ویان لێده‌كرد، كه‌م كه‌م و به‌ره‌ به‌ره‌ نه‌ك به‌ تێكڕایی و بێ مه‌ودایی زانستی فێری یارانی ده‌كرد .

﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ ...﴾[1]

قورئانێكه‌ به‌ جیاجیا بۆمان ناردوی، تا به‌ ئارامی به‌سه‌ر خه‌ڵكی بیخوێنیه‌وه‌.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴾[2]

بێبرواكان ده‌ڵێن، بۆچی قورئانی به‌یه‌ك پارچه‌ و به‌ تێكڕایی بۆ دانه‌به‌زیوه‌؟ ئێمه‌ بۆیه‌ به‌ به‌ش به‌ش بۆمان ناردی و هێدی هێدی و به‌ ئارامی بۆمان خوێندیه‌وه‌، تا دڵی تۆی پێ سه‌قامگیر كه‌ین.
له‌ وانه‌كانیدا وێنه‌و نمونه‌ی دێنایه‌وه‌و به‌ بابه‌ته‌ سه‌ره‌كی و هه‌ره‌گرنگه‌كان ده‌ستی پێده‌كرد، پاشان بابه‌تی وردو بچوك، وته‌كانی دوباره‌و سێباره‌ ده‌كرده‌وه‌ تا به‌ ته‌واوی تێبگه‌ن، به‌كرده‌وه‌ فێری ده‌كردن، وه‌كو ده‌سنوێژ و نوێژ و حه‌ج، كه‌ له‌به‌رچاوی خه‌ڵك ئه‌نجامی ده‌دان، تا به‌هه‌مان شێواز فێری ببن و ده‌یفه‌رمو:

صلّوا كما رأيتموني أصلي[3]

چۆنتان دیوه‌ كه‌ نوێژم كردوه‌ ئێوه‌ش ئاوا نوێژ بكه‌ن.

لتأخذوا عنّي مناسككم[4]

ڕێوڕه‌سمه‌كانی حه‌ج له‌منه‌وه‌ وه‌رگرن.

---

(١) (الاسراء - ١٠٦).
(٢) (الفرقان - ٣٢) .
(٣) أخرجه البخاري، ٦٣١ عن مالك بن الحويرث رضي الله عنه.
(٤) أخرجه مسلم، ١٢٩٧ عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما.

# ناوەڕۆك

ئەو دیمەنە جوانانەی لەم کتێبەدا ڕانوێنراون، دیمەنی بێ هاوتان و لە مێژوی مرۆڤایەتیدا ، یەکجار هاتونەتە ئارا، یەکجار دیدەنی خەڵکی پێ ئاشنا بووە ، یەکجار ئاسمان و زەوی شاگەشکە کردووە ، یەکجار بیابانەکان ، گەرمەسێری خۆیان ونکردووە ،یەکجار دێهاتەکان ، بەرەکەتیان بەسەردا باریوە ، یەکجار مرۆڤەکان ،دوجار لەدایکبونەتەوە، یەکجار روحییەت و سۆز و بەزەیی و ، ئازایەتیی و ئارامیی و بەخشندەیی ، لە جوانترین دیمەندا وەدەرکەوتون .

تۆش ! کچە کورد و کوڕە کوردی دینپەروەر! وەرە یەکجار، گەشتێ بەو دیمەنە دڵڕفێنانەدا بکە ، تا سەدان جار، چێژ و ئاسودەیی وەرگری. وەرە یەکجار، لە دیداری ئەم ژیانە پاك و پیرۆزەدا ئامادەبە، تا هەزار جار بەختەوەر بی و خەمەکانت ببڕێتەوە، ئازارەکانت لاچێ و برینەکانت سارێژ بێتەوە ، ڕوحت تام لە شیرینی بکاو شادیی بە دڵت وەربێتەوە.

ئارامی گرلانی

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

3000 دینار

